## لەم ژمارەیەدا




ڕۆشنبیری نوێ
گۆڤارێکی ڕۆشنبیری گشتی مانگانەیە
دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات
ناونیشان : دارالثقافة والنشر الكردية ـ ساحة الفلانی بغداد
تەلەفون ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەت

سەرنووسەر
اسماعيل رسول
جێگری سەرنووسەر
فائق جميل

## باسێك دەربارەی :-

# گەشەكردنی ئابوری لە كوردستانی عیراقدا

## شێوەو روخساری ئابوری كوردستان لە سەدەی نۆزدەمین دا

اسماعیل رسول

ژیانی ئابووریی گەلی كورد لەو سەدەیەدا هەر لە ژیانی ئابووریی ئەو گەلو نەتەوانە دەچێت كە لەگەڵیان ژیاوە وەكو گەلانی ئێرانیو توركیو عەرەبی ، مەبەسیشم لەمە پەیوەندییە ئابوورییەكانو پلەی پێشكەوتنی ئابووریو پەرەسەندنو گەشەكردنی هێزە بەرهەم هێنەكانە بەڵام لەگەڵ ئەو لێك چوونەشدا شێوەو سروشتی تایبەتی خۆی هەر بووە كە زادەی باری تایبەتیی جوغرافیاییو چۆنیەتی زەویو باری سیاسیی گەلی كوردە لە قۆناغە جۆربەجۆرەكانی مێژوودا ، لە ئەنجامی ئەمانەو چەوساندنەوەی هەمەچەشنەدا وای لێ هاتووە كە بە رادەیەكی گەورەتر بە دەست دواكەوتنی ئابوورییەوە بناڵێنێو لە پرۆژەكانی پەرەپێدانی ئابووری بێبەش بێت .

وەكو دەردەكەوێت جیاوازیی لە پلەی گەشەكردنی ئابووری لە نێوان هەرێمەكانی كوردستاندا لەلایەكەوەو لەنێوان هەرێمەكانی ئەو گەلانەی كە كورد هاوبەشی ژیانی ئابوورییانە ، بە كۆتاهاتنی سەدەی نۆزدەمینو دامەزراندنی حكوومەتە ناوەندییەكانی عیراقو ئێرانو توركیا پاش رووخانی ئیمپراتۆریی عوسمانیو دابەشكردنی موڵكەكانی لەنێوان دەوڵەتە ئیمپریالستە سەركەوتووەكاندا لە شەڕی یەكەمدا جیاوازییەكە ئاشكرا بوو .

كۆمەڵی كوردەواری لە سەدەی رابردوودا ، كۆمەڵێكی عەشایەری دواكەوتوو بوو ، رژێمی دەرەبەگی كە ئەوسا بە شێوەیەكی چڕوپڕ لە كاردا بوو باڵی بەسەردا كێشابوو ، ژیانی ئابوورییش بە درێژایی ئەو سەدەیەو هەتا بەشێكی گەورەش لە ساڵانی نیوەی یەكەمی سەدەی ئێستادا بەرادەی یەكەم لە سەر كۆڵەكەی بەرهەم هێنانی كشتوكاڵو مەڕوماڵات بەخێوكردن وەستابوو ، لەبەر ئەوە شتێكی سروشتییە كە بەروبوومی كشتوكاڵیو بەرهەمی ئاژەڵكردی وەكو گۆشت ، كەرە ، خوری ، پێستەو هی تر ببن بە یەكە سەرچاوەی ئابووریی زوربەی زۆری كوردی رەوەند یان چیاو زورگەنشینەكان ، كە بو دابینكردنی پێویستییەكانی ژیانی خۆیان یان بۆ ئاڵوگۆڕ پێكردنی شتومەكو پێویستییەكانی تری گوزەرانی ژین بەكاریان دەهێنا .

جوتیارانی كوردیش لە ناوچەی دەشتە گەورەكان یان لە پارچە زەوییە تەسكەكانی ناوچیاكان كشتوكاڵیان دەكرد ، جگە لەوەش رەزو باغی بەرو میوەی هەمە چەشنە (جۆرە) بە عەمایەت دەهێنا .

رژێمی موڵكایەتیی ناوچە شاخاوییەكان لە رژێمی موڵكایەتی دەشتەكان جیاوازە ، ئەوەش كە هەر دوو لا لە شتێكدا كۆبكاتەوە ئەوەیە كە لە هەردوولا رژێمی دەرەبەگی دەسەڵاتدارنو هێزە بەرهەم هێنەكانو هۆیەكانی بەرهەم هێنانیان دوواكەوتووە وەكو ئەمە كە دەبینی گاسنو هەوجاڕی دارو وولاخو كاری دەستو شێوەی سەرەتایی لە كردەوەی بەرهەم هێناندا باوە . بەگشتی بەرهەم هێنان لە خزمەتی بەكاربردنی راستەوخۆ دابوو ، ئەوەشی لێی زیاد بووایە بە شتومەكی تر دەگۆڕایەوە یان بە ( نەختی ) دەفرۆشرا ، بەڵام گۆڕینەوەی سەربەسەر زیاتر لە دێهاتدا برەوی هەبوو . لەبەر ئەوە یەكە دیمەنی ئابووریی كوردەواری، ئابووری‌یەكی سروشت كردبوو ، واتا « بەرهەم هێنان بۆ لە كاركردنی راستەوخۆ » .

وەكو هەموو كۆمەڵێكي لەم چەشنەی

رۆژهەڵاتیش ، کۆمەڵی کوردەواری چەند پیشەسازییو سەنعەتێکی دەستکردی لە ناودا بوو تاکو پێویستییەکانی کۆمەڵی دێهات بەرادەی یەکەم دابین بکەن ، بەڵام پیشەسازییەکی سەرەتایی بوونو وەستاو سەنعاتکارەکان یان خەڵکی دێهات بوون یان لەو شارو (شارەدێ)یانە دادەنیشتن کە وا لە ئەنجامی گەشەکردنی ئاڵوگۆڕ کردنی شتومەکدا پێدەگەیشتن .

نموونەی ئەم پیشەسازییانەش جۆلاییو شاڵ دروستکردن ( کری رانكو چوغە ) کە بە زۆری ژنكو بەرگی پیاوان لەو جۆرە بوو ، زوربەی پیشەکارەکانیش جوو بوون کە بە دێهاتو شارەکاندا بڵاو ببوونەوە ؛ هەروەها دروست کردنی تەورو گاسنو زەشماڵو قاپو دەفری ناوماڵو کۆزە گەرییو خەنجەر سازییو شیرگەرییو لەونو بەڕو فەرشیو هیتر .

باسیل نیکیتینیش(١) بە شێوەیەکی سەرپێیی باسی ئەو دیمەنە ئابوورییانەی کردووەو مۆرکی خێڵەکی دەرەبەگی کۆمەڵی کوردەواری بە شێوەیەکی گشتی دەستنیشان کردوومو دەسەڵاتداریی رژێمی ئابووریی سروشتیو پەیوەندییە دەرەبەگییەکانی تا چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەم دووپات کردووەتەوە . (٢)

گوندەکانی چیا میوەو توونو شتی تریان لەگەڵ خەڵکی دەشتی بەگەنمو دانەوێڵە دەگۆڕییەوە ، بەقاڵو دێوەرەی گوندەکانیش کەلوپەلو شتومەکی شارەکانیان لە دێهاتدا هەر بەهەمان شێوە ئاڵوگۆڕ پێدەکرد .

باسی گەشەکردنی ئابووریی کوردستانو پەیوەندییە ئابوورییەکانی ئەوسای سەدەی نۆزدەمین ، چار نییە پەلکێشمان دەکات بۆ ئەوەی ئەگەر بە کورتیش بێ باسێکی چەند کاروبارێکی گرنگ بکەین ، وەکو رژێمی ژیانی خێڵەکیو ئەو بناغە ئابووریو کۆمەڵایەتییانەی کە ژیانی ئەوسایان لەسەر دامەزرابوو . هەروەها باسی رژێمی پەیوەندییە دەرەبەگییەکانی ئەوسا باو بوو ، ئنجا پەیوەندیی ئەم دوو شێوە رژێمە بە ژیانی ئابووریی دانیشتوانی کۆمەڵی کوردەوارییەوە .

ئەوەی شایانی باسیشە ئەوەیە کە رژێمی پەیوەندییە دەرەبەگییەکانو رژێمی خێڵەکی ، هەردووکیان بە درێژایی ئەم سەدەیە شان بەشانی یەك رۆیشتوون ، چونکە هەر قۆناغێکی مێژوویی لە توانادا نییە بە شێوەیەکی کتوپڕی سەر هەڵبدات . هەروەها لە توانادا نییە گۆڕینەکانی جەستەی ئابووری ، پاشان گۆڕان لە جەستەی کۆمەڵایەتیدا بە شێوەیەکی خێراو لە وێنەی بازداندا بێتە دی . چونکە ئەگەر رژێمی نوێ لە گێژاوی کۆمەڵی کۆندا لە دایك بوو بێت دیسان دروشمو سروشتەکانی ئەو کۆمەڵە تا ماوەیەکی زۆر درێژە دەکێشێت ، پەیوەندییە نوێیەکان شان بەشانی پەیوەندییە کۆنەکان کە بەرە بەرەو نزمیو سووان دەچن ، رێ دەکەن .

دیاردەیەك لە دیاردەکانی دەرەبەگیی لای خۆمان ئەوەیە کە پەیوەندییە خێڵەکییەکانی دەپاراستو پتەوی دەکردنو لە چەوساندنەوەی چینایەتیدا کەڵکی لێوەردەگرتن . هەروەها هەستو نەریتی ژیانی کۆمەڵایەتی ناو خێڵەکانی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاردەهێنا . لەبەر ئەوە پاشماوەی پەیوەندییە خێڵەکییەکان هەتا پاشی پەیدابوونی پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان لە بەرهەم هێنانی کشتوکاڵداو هەڵوەشانەوەی چینی جووتیاران بۆ چەند پلەو پایەیەك ، هەتا رادەیەك هەر مانەوە .

هۆی ئەمەش ئەوەیە کە سەرۆك خێڵەکانو خاوەن موڵکە دەرەبەگەکان هەرخۆیان لە مەیدانی کشتوکاڵدا بوونەوە بە خاوەن موڵکی سەرمایەداری یان بوون بە بازرگانانی شار ، هەروەها پێگەیشتنی سەرمایەدارییش یەکجار لەسەرخۆو سست دەرۆیشت ، بۆیە لەو توانایەدا نەبوو کە وەرگەڕانێکی قووڵ لە پەیوەندییە ئابووریو کۆمەڵایەتییەکانی لادێدا بەرپا بکات .

**هەڵوەشانی رژێمی پەیوەندییە خێڵەکییەکان :**

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمدا زوربەی کۆمەڵی کوردەواری لە عەشایەر پێك هاتبوو ، ئەوانیش لە رووی پەیوەندییان بە کرداری بەرهەم هێنانەوە بۆ دوو شێوەی سەرەکی دابەش دەکران ، رەوەندەکان کە مەڕوماڵ بەخێوکردنو بە شوێن لەوەڕ گەڕان پیشەیان بوو .. شێوەی دووەمیشیان ، لادێنشینەکان کە کرداری بەرهەم‌هێنانی کشتوکاڵی بەڕێوە دەبەنو لە هەمان کاتیشدا مەڕداری دەکەن . پێویستە ئاوڕیش لەوە بدەینەوە کە شێوەو جۆری پەیوەندییە دەرەبەگییەکان ، هەتا رادەیەك ، لە نێوان لادێنشینان ـ نیشتەجێیەکان ـو خێڵە کۆچەرەکاندا جیاوازی هەیە .

(ریچ) لادێی‌یەکانی لە چاو عەشایەر بە (١) تا (٤)یان (٥) داناوە « عەشیرەتە رەوەندەکان ـ لە زاری ئەو بەگەی گوندی بێستانەوە کە لێی میوان بووە ـ دە هەزار خێزان دەبن کە هەر خێزانێك بەتێکڕایی (٧) سەر بێت ، لەو باوەڕەشدایە کە سەرژمێری عەشیرەتە نیشتەجێ‌یەکانی وەکو (کرمانج)و (نوورەددین)و (شینکی) هەر سێ‌یەکی ئەو ژمارەیە زیاتر نابن ، واتا نزیکەی سێ هەزار خێزان »(٣) .

لە ناوەندی سەدەی نۆزدەهەم بەولاوە . رەوەندەکان بەرەبەرە نیشتەجێ بوون‌و ژمارەیان لەکەمی‌داو ژمارەی گوندنشینەکان بەرز بووەوە ، ئەمەش دەست‌نیشانی پێگەیشتنی پەیوەندی‌یە دەربەگی‌یەکان دەکات بەشێوەیەکی هەست پێکراو . ئەو پەیوەندیانەی لە بناغەوە لەسەر چەوساندنەوەی چینایەتی لە کرداری بەرهەم هێناندا وەستاون .

(قاسملو) (٤) دەڵێ ڕەوەندەکان لە ناوەڕاستی هەمان سەدەدا سێ‌یەکی دانیشتووان پێك‌دەهێنن ـ سەرنجێکی قسەکانی (ریچ)بدە دەربارەی ساڵی ١٨٢٠و چۆن پاش تێپەڕبوونی ٣٠ ساڵ بارەکە بە پێچەوانە کەوتەوە ـ وا پێ‌دەچێ ئەم ژمارەیە لە ڕاستی‌یەوە نزیك بێت بەتایبەتی ئەگەر سەیرێکی لیستە سەرژمێری‌یەکەی ژمارە (٤)ی دکتور محمد سلمان حسن بکەین کە کتێبەکەیدا «التطور الاقتصادي في العراق » دایناوە کەوا دانیشتووانی ناوچەی باکووری بە ٣٦٥٠٠٠ کەس داناوە لەمانە ٧٠٠٠ یان رەوەند واتا ٣٦٪ی گشت دانیشتووان ، وە لادێ نشینانیشی بە ١٤٠٠٠ کەس خەمڵ کردووە واتا ٥٣٪ی دانیشتووان‌و شارنشینانیش ٥٥٠٠٠ کەس واتا ٣٣٪ی گشت دانیشتووان . (٥)

ئیتر تا دەهات نیسبەتی ڕەوەندەکان خۆی لە کەمی دەدا ، ئەوەبوو ساڵی ١٨٩٠ بوو بە ٣٣٪ بەرامبەر بە ٥٥٪ی گوندنشینەکان لە کاتێکدا نیسبەتی ژمارەی شارنشینەکان هەر لەسەر ٣٣٪ی خۆی مایەوە (٦) .

ئەمە وا دەگەیەنێ کە وەرچەرخانێکی گەورە لە لادێکان ڕوویدا لە ئەنجامی ئەو گۆڕانانەی کە لە پەیوەندی‌یە ئابووری‌یەکاندا سەریان‌هەڵدا بە هۆی پەرە سەندنی بازرگانی‌ی دەرەوە لە نیوەی دووەمی ئەو سەدەیەوە وە بە هۆی بەستنەوەی ئابووری‌ی کوردستان بە بازاڕی جیهانی‌یەوە لە ئەنجامی گەشەکردنی بازرگانی‌ی جیهانیدا .

ئەگەر چی پەیوەندی‌یە خێلەکی‌یەکان تێکەڵ بە رژێمی پەیوەندی‌یە دەرەبەگی‌یەکان بوون ، بەڵام پێکهاتنی کۆمەڵی خێلەکی لە رووی ئابووری‌یەوە . وەکو جاران نەمایەوە ، بەنموونە ئەوسا زەوی موڵکی گشت تاکەکانی خێلەکە بوو و شتێکی ڕوونە کە لە جەستەی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌ی خێلەکەدا چەند گۆڕانێکی گرنگ ڕوویدا .

« پەیوەستی‌ی کوردستان بە بازاڕی جیهانی‌یەوە بووە مایەی سەرهەڵدانی چەند گۆڕانێکی گرنگ لە ناو خێلەکاندا ، ئەوەبوو کە بەرهەمەکانی ئاژەڵ کڕیاری لە دەرەوەی بۆ پەیدابوو ، ئەمەش بووە هۆی گەشە پێدانی هامشۆو پەیوەندی‌ی ئاڵوگۆڕکردن لە نێوان خێلەکان‌و جیهانی دەرەوەدا ، لە ئەنجامدا بووە هۆی جیاوازیی رۆڵەکانی خێلەکان لە ڕووی دەوڵەمەندی‌و سامانەوە ، لە هەمان کاتیشدا کەوتنە هەوڵی پەیداکردنی لەوەڕگا کە پاشان بۆوە مایەی شەڕو گێچەڵی نێوان خێلەکان ، هەروەها بووە هۆی ئەوە کە ئاغاکان دەستیان بە سەردابگرن‌و بەزۆر بیان‌کەن بە موڵکی خۆیان .

لە ئەنجامی گەشەکردنی پەیوەندیی ئاڵوگۆڕکردن‌و کەمی‌ی لەوەڕگاکان‌دا ڕەوەندەکان بەرەبەرە ڕوویان لە نیشتەجێ بوون کرد . ئەو ماوەیەی کەوتوەتە نێوان دوا دوای سەدەی نۆزدەم‌و سەرەتای سەدەی بیستەم وەرچەرخانێکی کتوپڕی لە نیشتەجێ بوونی خێلە کوردە ڕەوەندەکان‌و زۆربوونی گوندو لادێ‌نشینان‌دا بینی . » (٧) بە سووکە ڕوانینێکی پێکهاتنی خێلە ڕەوەندەکانی کوردستانی عیراق جیاوازیی چینایەتی ناو خێلەکەمان بۆ دەردەکەوێت کە لەو سەدەیەدا پەیدا بوو . کەوا دەکران بەم بەشانەوە :

١ ـ سەرخێل یان ئاغاو خزمەکانی کە کاربەدەستان پێك دەهێنن‌و سەرپشکن لەماف‌و دەستەڵاتدا ، خاوەن گەورەترین پارچە مەڕو ماڵات‌و بە ئارەزووی خۆیان کاروباری لەوەڕگاکان هەڵدەسووڕێنن‌و بەشی خۆیان لە بەروبوومی ئاژەڵی لە ئەندامانی خێلەکە وەکو خوری ، رۆن‌و بەرخ‌و کار وەردەگرن .

٢ ـ پیاوانی ئاغاو سەرۆك خێل ( یان خولام ) کە هێزی چەك بەدەستی سەرۆکن‌و بەهۆی ئەوانەوە سەرۆك فەرمانڕەوایی‌و حوکمڕانی خۆی جێ‌بەجێ

دەکاتو لە شەڕو شۆڕی نێوان خێڵەکاندا کە لەسەر پاوانو لەوەڕگاو کاروبـاری تر روویدا بەکار دەهێنرێن .

شتێکی ئاشکرایە کە هێرشی ئەو خێڵو هۆزانە بۆ سەر یەکتر دەبێتە هۆی تالآنکردنی ڕانە مەڕو چەپاوو دزینی موڵكو سامانی خێڵە شکاوەکەو دەوڵەمەند بوونی خێڵە سەرکەوتووەکە بەتایبەتی سەرۆکەکانی .

٣ ــ ئەندامانی خێڵەکە ، بەهێزی راستەقینەی بەرهەم هێن دادەنرێنو هەرچی خەرجو باج هەیە لەوان دەستێنرێ ، ئەوانیش لە سامانی ئاژەڵدا وەکو یەك نین .

**گۆڕانی سەرۆك خێڵەکان بە خاوەن موڵکی دەرەبەگ**

وەنەبێ گۆڕانی سەرۆك خێڵەکان بە خاوەن موڵکی دەرەبەگ ، هەروەها نیشتەجێبوونی ڕەوەندەکان بەشێوەیەکی کتوپڕ یان لە ماوەیەکی مێژوویی دیاریکراودا بووبێت ، بەڵکو لە ڕاستیدا ماوەیەکی مێژوویی دوورو درێژی خایاندو کارەکە بە ئاوەخۆو بەرەبەرە پێك‌هات بەهۆی چەند ماکێکی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و دەوڵەتانەوە ، هەروەها پەیوەندی‌یەکی راستەوخۆی بەو کێشەیەوە هەیە کە لە نێوان ئیمپراتۆرە گەورەکاندا دەگەڕا لەسەر دەسەڵات رۆیشتوویان بەسەر خێڵە کوردەکاندا بە زۆری زۆرەکی‌و ستەمکاری ، کە زۆر جار دەگەیشتە ڕادەی هەڵقەنانو کۆچ پێکردنی هەزاران ڕۆڵە بەتایبەتی ئەوانەی لە دژ ئیمپراتۆری‌یەکان ، بە تایبەتی دوو دەوڵەتی دەرەبەگی‌ی ئێرانی‌و عوسمانی دەوەستان ، بە پێی رایەکی دکتۆر ( قاسملو ) رەگی ئەم کارە دەگەڕێتەوە سەدەی شانزدەهەم .

لەم ماوە درێژەدا پەیوەندی‌یە دەرەبەگی‌یەکان چەند شێوەیەکی جیاوازیان پەیدا کرد وەکو :

١ ــ شێوەی یەکەم : شێوەی خێڵە ڕەوەندەکان ئەوانەی ژیانیان لەسەر مەڕو ماڵداری‌یە ، کەوا ئابووریی ئاژەڵی ( الاقتصاد الحیوانی ) شادەمارەکانی

جا هەروەکو لەمەو پێش باسمانکرد پەیوەندی‌یە ئابووری‌یەکانی ناوخێڵەکان لە کاتی گەشەکردنی مێژوویدا گۆڕان . ئەوەبوو جاران ئەو پەیوەندیانە لە ئابووری‌یەکی خێڵەکی‌ی شێوە هاوبەشی ( واتا مەشاعیەت )ەوە هەڵقوڵابوون بەرەبەرە گۆڕانو بەرزو نزمی کەوتە ناو ڕۆڵەکانی عەشیرەتو جیاوازیی لە سەرو ساماندا کەوتە ڕوو ؛ کە سامانیش بە ژمارەی مەڕو ماڵات یان بە پارەداری دەپێورا .

ئیتر سەرۆك خێڵ لە سەرۆکێکی هەڵبژاردەی‌وا کە ڕۆڵەکانی خێڵەکە بەشداریی کاروباری خێڵەکەیان لەگەڵا دەکرد بوو بە فەرمانڕەوایەکی یەکتەنی خاوەن دەستو پێوەندو نۆ   کە لە کرداری چەوساندنەوەی ڕۆڵەکانی خێڵدا یار ـنی‌یان دەداو هەر چەند کرداری ئالوگۆڕکردن گەشەی بسەردایە کرداری گۆڕانی سەرۆك خێڵە ڕەوەندەکان بە گەورەی دەستەڵات بێ جڵەو لە هەلسووڕانی کاروباری خێڵەکەدا پێشتر دەکەوت .

٢ــ شێوەی دووەمی پەیوەندی‌یە دەرەبەگی‌یەکان، ئەو شێوەیەیە کە نێوان ژیانی کۆچەری‌و نیشتەجێ‌یی کۆ دەکاتەوە ، لەو خێڵانەشدا باوە کە لەتەك مەڕو ماڵات بەخێوکردندا کاری کشتوکاڵ دەکەن ، لەتواناندایە بەو خێڵانە بگوترێ نیمچە نیشتەجێ .

٣ ــ شێوەی کشتوکاڵی باوی خێڵە نیشتەجێ‌یەکان ــ گوند نشینەکان ــ ئەم شێوەیەش لە زەمانی زۆر کۆنەوە شان بەشانی ژیانی خێڵەکی کۆچەریی لێرەو لەوێ هاتووە . ئەو گۆڕینە زۆرانەی لە موڵکایەتی‌ی زەوی‌دا روویاندا کاریان لە شێوەی پەیوەندی‌یە کشتوکاڵی‌یەکانیش کرد . لە سەردەمی فەتحی ئیسلامی‌دا زەوی‌و زار موڵکی دەوڵەت بوو ، لە سەردەمی خەلیفەکانی عەبباسی‌دا والی‌و میرو سەر لەشکرەکان دەستەڵاتیان بێ‌سنوور بوو لەبارەی زەوی‌و زارەوە ، بەکرێیان بدایە دەیاندا .

« کەمێك بار لە کوردستاندا جیاواز بوو چونکە کشتوکاڵەکەی پشت بە باران یان بە ئاوی کانی‌یەکان دەبەستێت ، وە بەو جۆرەی کە لە میزوپوتامیا « وادی الرافدین » هەبوو پرۆژەی ناوەندیی ئاودێری تێیدا نەبوو . هەروەها رژێمی دەرەبەگی وەهای تێدا هەڵکەوتووە کە لە رژێمە دەرەبەگی‌یەکانی ئەورووپای چەرخەکانی ناوەڕاست دەکەن ، ئەوە بوو چەند میرنشینی‌یەکی سەربەخۆو نیمچە عەسکەری‌و دەرەبەگایەتی بەسنوورو سیستەم‌و لەشکری تایبەتی‌ی خۆیانەوە لە گۆڕێدابوونو دەوڵەتی ناوەندی نە دەسەڵاتو نەیاساو (٨) ... هتد نەبوو . وە لە ماوەی سەدەی نۆزدەمین‌دا موڵکایەتی‌ی زەوی لەم شێوانەدا دەبینرا :

زەوی‌و زاری میری ( دەوڵەت ) ، زەوی‌و زاری دەرەبەگەکانو زەوی‌و زاری جووتیارانو خاوەن موڵکە بچووکەکانو زەوی‌و زارەکانی ئەوقاف .

**باری بەرهەم هێنان :**

بەرهەم هێنان لە بارێکی دواکەوتنی زۆر بەسامدا بوو ، ئەم بارەش لە ژیانی جووتیارو گوندنشینە کلۆڵەکاندا رەنگی دەدایەوە . دەشتوانین هۆیەکانی ئەم بارەش لەم شێوەیەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە :

یەکەم ـ ئەو شەڕو شۆڕانەی ناو ناوە بەرپا دەبوون کارێکی خراپ وێرانکەریان لە ژیانی ئابووریدا دەکردو هۆیەك بوون لە هۆیەکانی شپرزە بوونی ژیانی ئابووری بەتایبەتی لایەنی کشتوکاڵی .

میرنشینە کوردەکان هەمیشە کەوتبوونە ژێر زەبری هەڕەشەی دەسەڵاتداریی عوسمانی لەلایەکو ئێرانییەکان لەلایەکی ترەوەو هەردوولا لەسەر بەتاڵان بردنو چەوساندنەوەی هەرێمە کوردەکان لە بەربەرەکانیدا بوون .

ئەو باجەی کە حکومەتی عوسمانی خستبوویە سەر میرنشینیی بابانو میرنشینە دەرەبەگییەکانی کوردی تر (٩) باجێکی قورس بوو ، ئێرانییەکانیش پەیتا پەیتا فشاریان دەخستە سەر میرنشینو عێلەساتە کوردەکان ، راووڕووتو چەپاویان بەردەوام بوو زۆر جار بەناوی (جزیە)وە خەرجو باجو سەرانەیان لەسەر دادەنان .

بێگومان قورسایی ئەو خەرجو باجانەش دەکەوتە سەرشانی رەنجبەران لە جووتیارە کلۆڵەکان کە ئەوانیش لە بەرەنگار بوونی ئەو ڕووتکردنەوە ئاشکرایە درێغییان نەدەکرد ، بۆیە عوسمانییەکان زۆرجار بە هێزی سوپاوە ئەو باجانەیان کۆدەکردەوە ، بەتایبەتی دوای خەفەکردنی ڕاپەرینە چەکدارانەکانو داگیرکردنی ناوچە کوردەکان .

سرنجێکی سەرپێیی لەو ڕاپەرینە چەکدارانەی کە جووتیارانی کورد دژی عوسمانیو ئێرانییەکان بەرپایان دەکرد بۆمان دەردەخات کە ژینی کوێرەوەریو هەژاریو بێدەرەتانی ، سیاسەتی باج دانان ، پاشان راکێشانی جووتیاران بە ناوی سەربازگرتنەوە بۆ ئەوەی ببن بە سووتەمەنیی شەڕی هەردوو ئیمپراتۆرییەکە ، ئەمانە چەند هۆیەکی بنچینەیی هەڵگیرسانی ئاگرەکە بوون ، هەروەها میرە کوردەکانیش دەیان زانی چۆن هەستو سۆزی جووتیارانو هۆزو خێڵەکان دژی دیلیەتی تورك بۆ کەڵکی تایبەتی خۆیان بووروژێنن .

( د . برانت )ی قونسوڵی بەریتانیا لە ئەرزەروم کە ساڵی ١٨٣٨ گەیشتە کوردستان باری کوردستانی ئاوا باس کردووە :

« بەڕێوە بەرایەتی خراپی هەوا کوێرـ سەردەستەی ئەو تەگەرانەیە کە لەبەردەم گەشەکردنی ئابووریی ناوچەیەکی پڕ لە خێرو سامانی سروشتیدا دەوەستن ، دارزیویی بەڕێوەبەرایەتی ، بەرتیل ، تاڵانکردنی خەزنەکان چەند سیفەتێکی سروشتکردی هەردوو ئیمپراتۆرییە دەرەبەگییەکەی تورکیاو ئێرانە . جگە لە بێشیرازەیی دەوڵەتیش ، ئەمانە گشتی بەشێوەیەکی توندو تیژ لە ژیانی دانیشتووانەدا ڕەنگی داوەتەوەو هەموو کۆششێك کە جاروبار هەندێ لەسەر کردەکانی تورکیاو ئێران دەیان کرد بۆ بە هێزکردنو بیرازکردنی دەزگای دەوڵەت وەکو باسایەك لە چوارچێوەی ئیسلاحێکی کەم دەرنەدەچوو و هەرگیز بناغەی پایەی کاربەدەستەکانی نەدەگرتەوە . » (١٠)

هەڵمەتەکانی سەرکوتکردنو دامرکاندنەوە وێرای مەرگەساتو کارەساتی جەرگبڕ بەئەنجام دەگەیشتن ؛ هەر جارە بەسەر ناوچەی کوردەکاندا لەشکرکێشی دەکراو بەکوشتاری تێکڕایی بێ ڕسینەوەو جیاییو وێرانکردنی گوندو کێڵگەو زەوت کردنی سەرو سامانی جووتیاران ئنجا دەرپەڕاندنیانو دوورخستنەوەی هەزاران خێزانی جوتیار بۆ شوێنی دوور دوور تەواو دەبوو .

لە لایەکی تریشەوە ، دەرەبەگو میرەکان هەوڵیان دەدا زەمینەی دەسەڵاتیان فراوانتر بکەنو هەمیشە لە شەڕو گێچەڵی نێوان خۆیاندا بوون ، بۆ ئەمەش پێویستیان بە خەرجی دەبوو ، هەروەها گەلێکیش لە ڕۆڵەی خێڵەکان وازیان لە کرداری بەرهەمهێنان دەهێناو خۆیان بۆ شەڕو شۆڕی هەمیشە تەرخان دەکرد . ئەم حاڵەتە بووە هۆی تێبەسەندنی چەوساندنەوەی چینایەتیو بار قورسکردنی جووتیاران بە زۆر چەشنە باجو سەرانە (١١) . هەروەکو جووتیاران ناچار دەکران کە خەرجو پیتاکی ئەو شەڕو شۆڕانە بخەنە ئەستۆی خۆیانەوە کە میرەکان بۆ خاتری بەرژەوەندو فراوانکردنی دەسەڵاتی خۆیان تێی دەکەوتن بۆ ئەمەش میرەکان تا ئەو پەڕی سود دەهاتن سوودیان لە نەرێتو عاداتی خێڵەکی وەردەگرت بەتایبەتی کە واباوبوو سەرۆك عەشیرەت یان میر لە پایەی باوك یان خاوەن ماڵ دابندرێن .

به نموونه میرەکانی بابان ، هەر لە چینی میرانی جەنگ دەجوون ، سەربازو دەستوپێوەندو گەنجینەو رژێمی خۆیان هەبوو ، بەهۆیانەوە خەرجو باجیان لە جووتیاران کۆدەکردەوە کە حالی ئەمانەش هەر « لە حالی قوله رەشەکانی هیندی رۆژاوای دەکرد تا رادەیەکی زۆر » (١٢)

دەرەبەگەکان پشتیان لە کشتوکال دەکرد ، زەوی‌و دیهاتەکانیان بەکرێ دەدا بە جووتیارەکان‌و بەشی خۆیان یان ( دەیەك)یان لێ وەردەگرتن . ریچ رای میرێکی بابانی دەربارەی باری ئابووری دەگێڕێتەوەو دەڵێ :

« محمد افا گوتی ـ نەبوونی ئاسایش مەملەکەتەکەی وێران کردووە ؛ ئێمە کە عەشایەرین ئەگەر بە تەواوی دڵنیا نەبین کە بەری زەوی‌یەکانمان هەڵدەگرینەوە خۆمان بەچاندنەوە خەریك ناکەین‌و مەملەکەتیش ناگەشێتەوە . بە نموونە من تەغارێك تۆوم بڵاونەکردوتەوە ، منیش دڵنیای ئەوە نیم کە ئایا سەرۆکەکەم لە فەرمانڕەوایی دەمێنێتەوە یان نا ، یاخۆ من هەتا رۆژی دروێنە هەر خاوەنی وڵاتەکەی خۆم دەمێنمەوە . ئیتر لە جیاتی ئەوە خۆم بیکەم لێ دەگەڕێم گوندنشینەکان زەوی‌یەکان دابچێنن بە ئارەزووی خۆیان ، لەدوایدا بەشە زەکاتی خۆمیان لێ دەستێنم یان دەیەك ، سەرباری ئەو شتانەش کە بەولاو بەملا بە هەر بیانوویەك بێت دەتوانم دەستگیری بکەم » .

دووەم ـ

نەبوونی رێگەوبان‌و دووریی کوردستان لە رێگەکانی بازرگانی‌ی جیهانی‌و سروشتی شاخاوی زەوی‌یەکانی بەیەکێك لە هۆیە گرنگەکانی دواکەوتوویی بەرهەم هێنان دادەنرێت . ئەوە بوو دەت دی بردنی بەروبرومی کشتوکالی‌و بەرهەمی ئاژەلی بۆ بازارەکان ئێجگار زەحمەت بوو ، بۆیە جووتیار ناچار دەبوو هەر لە کنەخۆی بەرهەمەکەی بەهەرزان بفرۆشێت‌و بکەوێتە دەست چەرچی‌و ریباو سەلەم خۆرەکان‌و بازرگانانی شار .

حکومەتی شاو سولتانی عوسمانی هیچ گوێیان بە دەسکاری‌و چاکی‌ی هەرێمە کوردەکان نەدەداو هەوڵیان نەدەدا رێگەوبانی بۆ ڕاکێشن . ئیتر ئەم بارە دواکەوتوویی‌یە بەدرێژایی سەدەی رابردوو تا بەشی گەورەی نیوەی یەکەمی سەدەی ئێستا مایەوە .

(١) باسیل نیکیتین ـ الاکراد ل ٣٦ ـ ٤٧

(٢) پاشماوەی ئابووریی سروشتکرد هەتا ساڵانی چلی ئەم سەدەیەمان بە ئاشکرا دیار بوو ، هەروەکو کە خەڵکی ناوچەی خۆشناوەتی‌و

(٣) رحلة ریج سنة ١٨٢٠ ل ١٢٤

(٤) کتێبی کردستان والاکراد ـ عبدالرحمن قاسملو : چاپی عەرەبی

(٥) التطور الاقتصادي في العراق : الدکتور محمد سلمان حسن ل ٥٣

(٦) التطور الاقتصادی في العزاق ـ د. محمد سلمان حسن . ل ٥٢

(٧) کردستان و الاکراد ـ ل ١٠٦ ـ عبدالرحمن قاسملو .

(٨) في سبيل اصلاح زراعي جذري في العراق ـ ل ٩

(٩) پیویستە لێرەدا پەنجە بۆ سیستەمی « التزام » کە بە ئیجارە یان زەمان گرتنیان پێ‌دەگوت رابکێشین کە کاربەدەستانی عوسمانی لە باجسەندندا بەکاریان دەهێنا کەو لەرێگەی ئاغاو دەرەبەگو میرو سەرۆك خێڵەکانەوە باجیان وەدەگرت . ئەم رێگەیەش بووە مایەی کوێرەوەری‌و ماڵوێرانی‌ی جووتیاران‌و شاندا هێزرانیان بە باری خەرجو باجو سەرانەی دوو لانە .

(١٠) الصراع علی کردستان ـ خالفین ـ ترجمة الدکتور احمد عثمان ص ١٨ ـ ١٩

(١١) قاسملو لە کتێبی ـ کردستان و الاکراد ـ دا شێوەکانی سەرانەو باجەکان باس دەکات کە لای‌ئێمەش ناسراون لەوانە مەڕانە ، رۆنانەو هێلکانە ، میوانانە ، پاسەوانی ، سوورانە ، سزادان‌و جەریمەکردن ، دەست بەسەرداگرتنی ئەو زەوییانەی کە هی وەجاغ کوێرانن جگە لە کاری بێگار وەکو خانووکردن ، جۆماڵ کردنی جۆگاو ، گواستنەوەی بەشی خاوەن موڵك لە بەرووبووم ، پاسەوانی‌و کارکردن بە خۆڕایی لە زەوی‌ی دەرەبەگەکان‌و بردنی دارو ئالیکی ئاژەڵ‌و ... شتی‌تر بۆ ماڵەکانیان .

(١٢) رحلة ریج ـ چاپی عەرەبی ل ٦٢ ـ ٦٣

(١٣) هەمان سەرچاوە .

# «کە» لە زمانی کوردیدا

* محمد احمد سعيد *

ئەگەر بێت‌و بە سەرنجێکی وردو ڕێزمانی‌یەوە لە زمانی کوردی بکۆلینەوە دەرئەکەوێ . کە زمانی کوردی زمانێکی فرەگرە . مەبەست لە فرەگریش ئەوەیە کە کۆمەڵێ پێشگرو پاشگرو ناوگر هەن . ئەچنە سەر ووشەی سادە . ووشەی تازە پێک‌ئەهێنن بە واتا ووشەی ئالۆز «دارێژراو» دروست ئەکەن . گومانی تێدانی‌یە کە ئەمەش بە لگەی رەسەنێتی زمانەکەمانەو یەکێکە لە خاسی‌یەتەکانی کە بووەتە هۆی دەولەمەندکردنی چ لە ڕووی زمان‌و چ لەڕووی ڕێزمانەوە .

ئەم پاشگرانە یاپێشگرانە لەکاتی خۆی‌دا هەریەکەیان ئەشێ ووشەی واتادارو بە مانابوونە وە لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکاری‌و تەئسیرانەی بەپێی دەورو زەمان‌و سوڕانی چەرخ گۆڕانیان بەسەردا هاتووە ، چ لەرووی لەناوچوونی هەندێ لە دەنگەکانیانەوەو چ لەرووی شێوەکانیانەوە . وە ئێستا مانای تەواوی خۆیان ڕوون‌و ئاشکرا نین . تەنها ئەوەنەبێ کە ئەچنە سەر ووشەی سادە ووشەی‌تر دروست‌ئەکەن‌و ئەبنە هۆی گۆڕینی واتاو روخساری وشە بەواتا ئەرکێکی لەبار ئەبینن لە زمانی کوردی‌دا . . . وە لە ڕێزمان‌دا وەکو زیادی‌یەکی بێ‌واتا ناوئەبرین . کەچی ئەرکی رێزمانیشیان هەیە وەك . هەل ، دا ، وەر ، ەوە . کە ، ك . تادوای .

ئەم پاشگرانەشی لەلایەن زۆربەی زمانناسە بێگانەکان‌و کوردەکانەوە زۆر باس‌کراون لێکولینەوەیەکی زۆربان لەسەر نووسیوە . لێرەدا

جێگای ئەوە نی یە کە یەك یەك باسیان بکەین چونکە نامەوێ ووتارەکە دوورو درێژ بکەمەوە . بەڵام ئەوی مەبەستی منبێ ئەوەیە کە " کە " لە زمانی کوردیدایە .

لەو چەندانەدا نووسینێك دەربارەی پاشگری " کە " لە ژمارە " ١٥ " ی ساڵی ١٩٧٨ ی گۆڤاری رۆژی کوردستاندا لەلایەن ( عبدالقادر محمد ئەمینەوە ) بلاوکرایەوە . بە ناونیشانی لیکۆلینەوەیەك لەسەر پاشگری " کە " لە زمانی کوردیدا [1] . جا لەم ووتارەدا ئەمەوێ هەندێ سەرنجو تێبینی بخەمە روو سەبارەت بەو باسە .

گەر بەو لێکۆڵینەوەیەدا بچینەوە بیخەینە تەرازووی ر... ەی زمانەوانی یەوە بەووردی ... بدوێین دەرئەکەوێ کە لە هەڵ ناتەواوی بەدەرنی یە وەناوەڕوکو ووتارەکەش لەگەڵ ناونیشانەکەیدا ناگونجێ . چونکە لە زۆر شوێندا خۆی لە باسەکە شاردووتەوەو چووەتە ناخی چەند باسێکی ترەوە . کە پێوەندیێ پێوەنی یە . باسی چەن ئامرازێك ئەکات وەك " ێك " ی نەناسراو . وە " ەکە " ی ناسراو . شوناسو پاشگری " ك ـ ik " ... تادووایی .

(١) کاك محمد ئەحمەد ئەگەر لە هێنانەوەی بەلگەکانیدا بۆ بۆچونەکانی پەنجەی بۆ زمانەوانەکان بردایە کەلەمە دواون . باسەکەی بەهێزتر دەبوو .

... رۆشنبیری ...

« سەرنجە کان »

١ ـ رای نووسەر لەوەدایە کە پاشگری " کە ـ ك " لە زمانی کوردیدا کە یەکێکە لەو پاشگرانە کە دەبێتە هۆی دەولەمەندکردنی زمانەکەمان (٢) .

لێرەدا " کە ـ ك " هەردووکیانی بەیەك پاشگر داوەتە نوسین . بەڵام لە کاتێکدا ئەگەر وەکو پاشگر سەیریان بکەین جیاوازیان لە نێواندا هەیە . بۆنموونە :ـ

**دەس + ك ← دەسك . کە ئەسلەکەی ((ik))**

**لووت + کە ← لوتکە**

٢ ـ ... " کە " دا نووسەر ئەنو... ـە " یەکێکە لەو پاش... ـە ... ـاوێ ناسراو دروس... ت وەك ئەم ناوانە . کچ ـ کو... پیاو ... کچەکە ـ کورەکە ... وەکە ـ (٣) بۆ دروستکر... ناو... شوناس . ناسراو ئام... ... نیشانە " ەکە بەکار ئەه... نەك پاشگری " کە " وەك :ـ

**بەرخ + ەکە ← بەرخەکە**
**هەنار + ەکە ← هەنارەکە**

بەڵام لەهەندێ شوێندا تەنها " کە " دیار ئەبێ بەتایبەتی لەو ناوانەی کە بە دەنگی بزوێن کۆتاي ـ یان دێ وەك :ـ

**ووشە + ەکە ← ووشەکە**
**مامۆستا + ەکە ← مامۆستاکە**
**دۆ + ەکە ← دۆکە**
**هەرمێ + ەکە ← ...رمێکە**

هۆی ئەمەش ئەوەیە کە دوو بزوێن بەیەکەوە دێن بزوێنی کۆتایی ناوەکەو بزوێنی سەرەتای نیشانەی " ەکە " لەو بەیەکەدا یەکێکیان تێئەچێ ئەبینین لە نموونەکانیدا بزوێنە کورتەکەی سەرەتای " ەکە " تێچووە . چونکە ناتێ دوو بزوێن بەدووای یەکدابێ . حەزی وانی هەیە کە بۆ ئەوەی هەردوو بزوێنەکە بپارێزرێ دەنگێکی نیمچە بزوێن ئەچێتە نێوانیانەوە وەك .

**گا + ەکە ← گایەکە**
**دۆ + ەکە ← دۆیەکە**

٣ ـ هەر لەهەمان پەرەگرافدا باسی ناوی نەناسراوی کردووە کە سەر بە ناونیشانی باسەکەنی یە . وە پێوەندی بە پاشگری " کە " وەوە نی یە. بەلکو ئامرازێکە \ نیشانەیەکە ناو ئەکات بەناوی نەناسراو وەك :

**بەرخ + ێك ← بەرخێك**

نەنیشانەی " ەکە " ی ناسراو \ شوناس پاشگرە یاخود پاشگری " کە " یەوە نە " ێك " یش پاشگرە بەلکو هەردووکیان دوو نیشانەی ناسراوو نە ناسراون / شوناسو نە شوناسن .

٤ ـ دێتە سەرئەوەی کە باسی دەوری " کە " بکات . ئەوی شایانی باسبێت لێرەدا وەکو پاشگر ئەدرێتە قەڵەم . بەڵام لە هەندێ شوێندا بە تەواوی بۆی ئەچووە وەك :ـ

آ ـ بە هۆی دروستکردنی ناو لە ناو . لە نموونەکاندا . ووشەی " چڕ " ناونی یە بەلکو ئاوەڵناوە . ئەلێین دارستانێکی چڕە ... یانی ... .

ب ـ ناو لە ئاوەڵناو دروستدەکات ئەو مانایەی کە ناوی یەکەم هەیەتی دەگۆڕێن بۆ ناوێکیتر وەك :ـ

**پیس ← پیسکە .**
**جـــوان ← جوانکـــــە .**
**تادووایی .. (٤)**

بەکەمیانجێیخۆی نیبە چونکە پێشی خۆی ئاوەڵناوە وە « پیسکە » ش هەرئاوەڵناوە .. جگـــەلەوەش ئەڵێ « ئەو واتایەی کە ناوی بەکەم هەبەتی » هەڵەیــــە . ئەبوایـــە بینوسبیانـــە ئەو واتـــای کـــە ئاوەڵناوی یەکەم یان ووشەی بەکەم هەیەتی دەگۆڕێت .

٥ ـ « کە » ناو لەفرمان دروســـت ناکات وەك کاك ( عبدالقادر ) ئەڵێ « کە » بەکێکە لەو پاشگرانەی کـــە ناو لە فرمان دروستدەکات وەك \ تەبکە ـ فڕکە . [٥] ..

بەڵکو « کە » ئە چێتە سەر ڕەگی فرمـــانو ئەیکاتـــەناو ... وەك نموونەکانی خۆی .

٦ ـ لـــە لاپەڕە « ٥٦ » دا دەوری « کە » ی بەچەند جۆر باسکردووە وەك « کە » دەبێتە مەرج لە ڕستەی کە تۆ نەڕۆیت منیش ناچـــم . وە دەبێتە ئاوەلکار لە ڕستەی ، کە تۆ هاتی من دەم نووسی .

دەبێتە ئامڕازی پەیوەنـــدی لـــە ڕستەی نامە کەی کە تۆ هێنات من بڕوم . وە لـــەم ڕستانەدا کـــە هەرسێکیان ئالۆزن وە « کە » وەکو ئامڕازێکی پێوەندی یاخوود لێکدەر بە کار هاتووەو دوو ڕستە بەیەکەوە ئەبەستێ .

٧ ـ لەباسی پاشگری « ك » \((ik)) دا لە هەندێ جێگەدا پەهەڵەجورە . وەك لە خاڵی دووەم نوسیوێتـــی ئەبێتە هۆی دروستکردنی ناو لەناو بەڵام لە هەندێ نموونەکانیدا بـــۆی ئەچووە وەك :ـ

**دڕ ← دڕك .**
**تەڕ ← تەڕك ...**

دڕ، و تەڕ هەردووکیان ئاوەڵناون ئەك ناو ...

دڕ بۆ سەگی هار . یان مرۆنی بێ حەیاو چاونەترس وەیا بۆ شـــتێ ئەوترێ کە زبر بێت .

وە تەڕ ئاوەڵناوە ئەبوایە ئەمانەی لە خاڵی سێیەمدا باسی بکردایە ..

د ... ئەگەر بێتەوە ســـــەر ناونیشانی ووتارەکەو ناوەڕۆکـــی ئەبینین جیاوازییەکی زۆر لــــە نێوانیاندا هەیە . ناونیشانەکـــــە لەبارەی پاشگری « کە » ەوەیە . لە ناوەڕۆکدا باسی ئامڕازی « ەکە » و « ێك » ناسراو نەناسراو ئەکات . وە بەوەوە نەوەستاوە چووە لـــــە جیاتی نیشانەی « ەکە » ی شوناس پاشگری « کە » ی بەکارهێناوە . کە ئەمەش لە ڕێزماندا هەڵەیەکـــی گـــەورەیە . وەهەروەهـــا وەکو ئامڕازێکی پەیوەندیش ناوی بردووە. وشێوەی ( ik )یشی لە هەمـــان باسدا بەکار هێناوە ، بە کورتـــی بابەتەکەی تێکـــەڵ و پێکەڵ وئالۆز کردووەو بە تەواوی مەبەستەکانی نەپێکاوە ...

...لە کۆتاییدا حەزئەکەم ئەوە ڕوون بکەمەوە کە « کە » لە زمانی کوردیدا بەچەند شێوەیەك خـــۆی ئەنوێنێ وەك :ـ

**١ ـ (( کە )) ڕەگی کردار / چـــاوگی (( کردن )) ە .**

**٢ ـ (( کە )) ئامڕازی لێکدەرە وەك لەم نموونانەدا .**

من کە ڕێبوارم سەرێی ئەڕوانم. ئەو پیادەی کە تۆ بینیت باوکـــی ئازادە .

٣ ـ « کە » وەك پاشگر ئەچێتـــــە سەر ووشەی سادەو ووشـــــەی دارێژراو دروست دەکات وەك :ـ

آ ـ ئەچێتە سەر ناوی سادەو ناوی دارێژراو دروستدەکـــات . نموونـــە :ـ

**لت + کە ← لەتکە ، لوت + کە ← لوتکە .**

ب ـ ئە چێتە سەرئاوەڵناوی سادەو ناوی دارێژراو دروســـت ئەکـــات نموونە :ـ

**ڕەش+کە ← ڕەشکە ، قوول + کە ← قوولکە .**

ج ـ ئەچێتە سەر ئاوەڵناوی سادەو ئاوەڵناوی دارێژراو دروستئەکات

**نمونە :ـ**

**پیس + کە ← پیسکە .**

د ـ ئە چێتەسەر ڕەگی فرمان \ چـــاوەگی سادەو ناوی دارێژراو دروستئەکات نموونە :ـ

**فڕ + کە ← فڕکە ، تەپ + کە ← تەپکە . کە لە ( فڕیـــنو تەپین ) ە وە هاتووە .**

(١) کۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە « ٥١ » ی ساڵی ١٩٧٨ .

(٢) ـ (٣) کۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە « ٥١ » ی ساڵی ١٩٧٨ . ل \ ٥٦

(٤) ـ (٥) هەمان سەرچاوە هەمان لاپەڕە . ستوونی دووەم .

(٦) هەمان سەرچاوە لاپەڕە « ٥٧ » ستوون دووەم .

# ئەم کتێبەم خوێندەوە :-

## * رۆئوف احمد ئالانی *

# رێزمانی کوردی


ریزمانی کوردی
RÈZMANÎ KURDÎ
قواعد اللغة الكردية

بەکـوردیو بەعەرەبـی بەرگـی یەکـەم ، چاپـی ۹۷٦ ـ دانانـی ـ احمد حسن احمد

پێشەکی سوپاسی دانەر دەکەم کەخۆی بۆ زمانەوانی تەرخان کردوە وەك خۆی لـە لاپـەرە ـ٤ـدا نووسیویە : (( هیچ زمانێك بەبێ رێزمان ناتوانرێت بەدروستی بنووسرێت )). بەهەمان هەستەوە کتێبەکەم خوێندەوە ، کە نزیکەی سێسەد لاپەرەی قەبارە گەورەیە ، منیش بەنیازی خزمەت چەند تێبینی یەك دەخەمە روو ، بۆ باری سەرنج و هاتنەدانی لاوە خوێندەوارەکانمان لەم مە دانە پیرۆزەدا .

بۆ دالدەی باری بۆچوون ، چەند خالێکی سەرەتاکەی لەمەڕ خۆی دەکەم بە بەرایی و تارەکە ، دەلێت :

۱ ـ سەرتوکەکەم لە شکلێکی ئەکادیمی فراواندا دانا ...

۲ ـ یەکەم سەرچاوەم زمانەکەی خۆی بوو . سوودیشم لە زمانی عەرەبیو هەندێك لە زمانی ئینگلیزی وەرگرتووە . کەلکم لە هەندێ سەرچاوەی چاپکراوی کوردی وەرگرت ( ئەگەرچی رەسەنیش نەبوون ).

۳ـ هیوادارم کەئەم سەرتووکە ببێتە بنچینەی زمانی یەکگرتوو بۆ هەموو شێوەکان . وە بیتی گۆڕم بۆ لاتینیو ئینگلیزی لەپاشە رۆژدا .

٤ ـ سوپاسی کۆڕی زانیاریو بەڕێوە بەرێتی گشتی خوێندنی کوردی دەکەم . کە لەدەست نووسینەکەی بەرگی یەکەم وردبوونەوەو یارمەتی لەچاپدانیان دام . ـ

٥ ـ ئەم کتێبە بۆ فێربوونی هەموو خوێندەوارێکە ( مهماکانت ـ مستویاتهم الدراسية ) .

٦ ـ تۆمارکردنی رێزمان لە قالبێکی ئەکادیمیو بەدوور زمانو بەبێ سەرچاوە ، بەجێ هێنانی کارێکی وەها بەتەنیا کەسێك لاموایە سووكو ئاسان نەبێ ... هتد .

**لەو خالانەوە چاوەروانی چیدە کرێت ؟!**

**۱ ـ دەبێ زمانی دارشتنی کتێبەکە ئەوپەڕی کوردانەو رەسەنو پاراو بێبیت ...**

**۲ ـ ئەوخەرمانە لێکۆلینەوەی کە چارەکە سەدەیەکە لەزمانەکەماندا شەنو کەوی لێ دەکرێت ، بەتایبەتی کاری زانستانەی مامۆستا تۆفیق وەهبیو هەولی بێوچانی بەرێوەبەرایەتی خوێندنی کوردیو دەوری بەتەوژمی کۆڕی زانیاری کوردو هیچەند کەسانی تر ،**

یەرهەمی ئەمانە بەگشتی ( لەباوەڕی دانەردا ) دەبێ ــ نارەسەنبن ...
دەبێ کتێبەکەی لەمەڕ ئەو ڕێبازێکی تازەو جیاواز بێت .

٣ ــ کتێبێك بێو ئەکادیمی بێت‌و بەبێ‌سەر چاوە بێت و بۆ هەمــوو بلەی خوێندن بێت ، لە قۆناغــی سەرەتایی‌یــــەوە تـــا زانکـــۆو بەولاتریشەوە ــ دەبێ سرووشێکی ئاسمانی بێت !!

٤ ــ سوودی لە زمانی فارســـی وەرنەگرتووە ، کـــــەبمانەوێ و نەمانەوێ ( باجیاوازیش بن ) ، لەم کارانەدا دەستە مڵانی یەکدین .

٥ ــ دوو دەزگـــای ئاکـــادیمی‌و رۆشنبیری‌ی مەزنیــش بــە ئــەو کتێبــەدا چووبنـــەوە ئەمەشـــی دەمانخاتە سەر سامی‌یەوە ؟! لەبەر ئەوخالانە زمان دۆست کەلکەلەی دەکەوێتەسەر کە بەچاوی مشتەری سەرنجی ئەو جۆرە کتێبانە بــدات نیچێنێك :

آ ــ ئەگـــەر پشووی بۆ بدرێت‌و بابەتیانە پێیدابچینەوە بەلای کەمەوە (٢٠...) لاپـــەرەیەکی دەوێت بـــۆ هەلـــەنکاندن ئەمەش کاری کردەنیە !؛ هەر لەبەر ئەوەیە کە بەلێنمدا بۆ باری ســەرنج چەند لایەنێکی نکـــەم بەنموونەو بیخەمە ڕوو .

ب ــ وەك بۆم دەرکەوتووە زۆر لایەنی زانستیمان وەلا ناوە یان چەواشـــە کردووە لە بەر ئەوەی کە :

١ ــ بە زارا وەی کـــوردی‌ی رەوان ( لەبەرنەبوونی یان سۆراغ نەکردنی ) بۆمان دەر نابڕێت .

٢ ــ وامان خوو پێوەگرتــووە ، ئەگەر بابەتێکی زانستی‌ی کـوردی بەزارەوەی بێگانە دەربڕا ئەوا کوردی نیـــەو خواستەمەنی‌یە ، وادابنێێن کورد ئەندامێکی لەشی هەیە کـــە پێ دەلێن ( اووت ) جـــا ئەگـــەر بەزاراوەیەکی تر دەر بڕا مانای‌وایە کورد ئەندامی (لووت)ی نیەو لــە گیانداریکی ترێ خواستووە و بــە خۆیەوە نووساندوە . خوانە خواستە مەبەستم ئە ودنیە کەبەرەو سامال‌و پاکژی‌ی زمانەکەمان تەکان نەدەین ، مەبەستم ئەوەیە لەم بارەوە ژیرانەوە زانستانەو ڕاویژکارانە هەنگاوبنێین . لەبەر ئەوە ئەگـــەر لــە هەنــــدێ هە لوێستداو لـــەم وتارەمــــدا کوردی‌یەکەم تەواو پەتی نــەبوو ، جارێ لێم مەگرن .

ج ــ بـــاری رەوشتایەتیمـــان (بەتایبەتی لەزمانەوانیدا ) : دیسان وامان خوو پێوەگرتووە ، هــــەر کەسەمان دابەزی‌یە ئەم مەیدانە ــ دبێ قوتابخانەیەکی تایبەتی بنیادبنێ لە :ــ زاراوەی خۆی ... باوەڕی جیاوازی خۆی ... زانستی خۆی رێنووسی خۆی ... لـــە هـــەر زمانێکی دەرەکیدا بەلەدی هەبێــت ( بۆ یادگار ) کوردی‌یەکەی پی‌بەبێز بکات ... تایبـــەتەکانی زمانـــە کوردی‌یەکەی بێ رەنگ بکـــات ،، خوانە خواستە ــ مەبەستم ئەوە نیە کە لە زانستە بێ تەرەفەکان کەلك‌ــ وەر نەگریــن . وامـــان خـــوو پێوەگرتووە کەسمان خەتی ئـــەوی دیمان نەخوێنێتەوە ، لەوە دەچێت :

ا ــ دەلێت : زەوی خرە .

ب ــ دەبێ جوارگۆشە بێت .

ج ــ ئەخێر ! سێ گۆشەیە .

د ــ بار لاکێشە بێت ... هتد .!!

لە گەڵ ئە و قسە زلانەش نیم کە دەبێ هەر لەسەر قالبچەکـــەی سلێمان پێفە مبەرەوە ، شێرازەو تەون دابەستین .

بەسەر کردنەوەیەك :

دانەر بەلێن دەدات کە ڕێزمانێکی کوردی ( بۆســــەرتاپای دیالێکت‌و بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردی ) دابنێت .

ــ یەکەم : وادیارە بەدەربەستی مێژووی زمانەوە نی‌یــە باوەڕیشی بەزمانی ئەدەبی یەك گرتومان نیە ، تائێستاش بەدەسەلاتترین گەل لە جیهاندا ، شتی وای بۆ نەکـــراوەو ناشکرێت . !!

دودم : پێو ســــت بەدانانـــــی (سپرانتۆ)ی گشـــت دیالیکتیکەکان ناکات ... جونکە ئەوە لایەنێکی ترە، کە زمانی قسەیە ...

بۆئەم مەبەستە لەمێژە خـــوا کتێبە ڕێزمـــــانێکی تری بۆ داناوین ئەویش پرینی‌یە لە ( نەتەوەی کورد ) خۆی . هەرهۆزەو هەر ناوچەیەك ، بە ئاوازو دەســــــتووری خۆیـــان ( دوورو نزیك ) قـــەی خۆیـــان دەکەن‌و زیندەیەکە هەر دەمێنێت .

نموونەی بۆچوونی لە ( ئەلفـــو بێ) یەکەیدا :ــ

١ ــ پەنجاو چوار لاپەرەیە ، بەبێ دۆزینەوەی هیچ شتێکی تازە .

٢ ــ دەنگداری داناوە بە (بێ دەنگ)و بزوێنی داناوە بـــە ( دەنگدار ) . ئەمەش بە پێچەوانەی زانســـــتی ئــەمڕۆو پووچ‌کردنـــەوەی بــاری فیزیایی‌یە لەچۆن کەوتنەکاری دەنگە ژێ‌یەکان .

٣ ــ دەلێت : بزوێنی ( ء ) بـــەلای چەشن‌و سروشتی خۆیدا بەیەك لادا درێژ دەبێتەوە (هەلکشاوی) ،وەك: ( ئا ا ا ) بـــــەلام کـــــە بلێین : ( ئێ ، ئو ، ئۆ ) ئەوە ــ تێکەلـــێ بزوێنێکی‌ترە ....

سەرنج : ( ء ) پیتی دەنگە ، وەك ( ج ) . دیسان (ئا) ــ بڕگەیە ، وەك ــ گا ــ . بەهەمان سازگە ( ئی ، ئو ) وەك ( جی ، جۆ ) بڕگەن ، واتـــە :

**( دەنگ + بزوێن ) نەك ( بزوێن + بزوێن ) بە پێی ئەو بۆچوونە هەڵەیە .**

٤ ـ لادان لە زاراوەی ( بڕگە = مقطع ) بۆ « دابڕ = قاطع » لادانە ـ لە راستی وزانستی وشە سازی .

٥ ـ بۆ ئـەوەی کـە زانســـتانە کەرەسەی زمان دابەش بکرێـــت لەمێژە ( پیت ) بە رانبەر بە [ حرف ابجدي ] دانـراوە ، کـــە چـی بایداوەتەوە بۆ ئالۆزکان ، پیتـی گەڕداوە بۆ : ( ئەلفوبی ، ) بـۆ : نیشانە ... پاشگر ، پێشـگر ، بەنـــدە فۆنێم ... ئامـراز ... هتد . !!

ئەگەر لەسەر دەمێکداو لەسەر کۆنە دابەشکردنەکەی یۆنانی یەکار بێجگەی ناوەو ـ کرداریـان بـــە (حرف) دەر بڕیبێت ، ئیشمان بەو لاسایی‌کردنەوەیە نیە ، ئەگەر لــە بڕێ زماندا ، چـــەسپی بێت ، بۆ زمانی کوردی ، هەر دەست نادات.

**بڕی نموونە لەســـــەر شێوازی کوردی نووسینەکەی :**

**١ ـ ((زمانی کوردی : ر[illegible] لە ماخە جیا کەرەوە گرنگەکانی [illegible] ی ئاریـ[illegible] ، ئەوەیە کە لە بنجی [illegible] گۆڕ و[illegible] بە ئا[illegible] پیك هـــاتوونو داناشتیان [illegible] جێ‌بەجێ نەبێ کـە بنجەکەی سەرچاوەیە ـ ل (٣) )) .**

**٢ ـ (( راناوی جیـــاوەز پیتـــی پێشکەوتووە = ضمیر منفصـــــل مسبوق بحرف ، ل ١٥٩**

**٣ ـ (( کاتی ئێستا = زمن‌الحاضر ، دەشێ دوای هـــــەموو ـ راناوە جیاوازەکان بکەوێ )) ل ١٥٢ .**

**ئەگەر خوێنەر توانی لەو نموونە کوردیانەدا نیاز بەدەست بهێنێ ، گلەیی نایەتە سەر !!**

**نموونەی لادانی لـــە دەستوور سازیدا :**

١ ـ ئەلێت : (کاتی ئێستا) دەکەوێتە دوای راناوی سەربەخـۆوە .... جارێ زەمان ـ بە رووتی قەبارەی نیە ، تابینـــرێ وبپیســـترێو بەرودوای رســـتە بکرێ دەشێت وشەیەك کە زەمان بگەیەنێت دەوری رستە سازی یان وشـــە ســـازی ببنێت .

گوایە ئەم دەربڕینەی کردووە بە قالبی [فعل کینونە]ی کوردی ، وەك (ئازاد سـەربازە ، من سـەربازم ...) دەڵێت : پیتی(ە(م ... ن ... کاتی ئێستان .

لەم‌باسە ئاڵۆستاش کێشەی لـە سەرە ، مامۆستا تۆفیق وەهبی بە کرداری بوونی ناتــــەواویان دادە نێت، لەسەر شێوازی ئینگلیزي... بەم شێوە لـــەبەرنامەی خوێندندا چەسپیون ، زانا (منطقي)یەکان بە ( رابط ) یان داناون لــــە رستەی ناوی‌دا ، لەهەمان کاتدا لە رانـاو ناشۆرێن .

مامۆستا مسعود محمدیش رای تایبەتی هەیە ، منیش لە میانـــی رەخنەدا کاتی خۆی لە گۆڤـــاری برایەتیدا ،وتارێکم لەو بارەیەوە بلاو کردووەتەوە .

بەڵام کاك ( احمد حسن ) تەنهـا لایەنە رواڵەتیەەی وەرگرتـووە ، بەپێی هەڵکەوتی لە رستەدا ...

ئێمە کە وتمان نسبەتی بـــون دەگەیەنن‌و رستە تەواو دەکـــەن پێویست ناکات بڵێی دەکـــەونە دوای رانـــاوەوە ... نـــاوی سادەوە ... ناوی لێکدراوەوە ... ئەگەر سەدان نموونەی تریش ، بەو بۆچوونەوە بهێنیتەوە کارکـــەی دابێ نابێت . لەسەر ئەم لایەنـــە بەبێ دەستوورانە مەلزەمەیەکـــی کتێبەکەی پێ گرتووە . تەنانەت کە چڕاندوویەتیـــە باســـی رانـــاوی ئیشاری‌یەو ەو لـــە لاپەڕە (٧٤)دا نووسیویەتی :ـ

« اما ـ ئەم ـو ـ ئەمان ـ فلیس لهما اسم اشارة ... الخ » ـ ئەو دوو بێژەیە خۆیان راناوی ئیشارین ، ئێتـر رانـای ئیشـــاری تریـان بۆچی‌یە ؟!

ئەگـەر مەبەستی نیشاندارو = مشاراليه ـ یش بێت ، ئەوا هەیانە، وەك (ئەمە پیاوە ، ئەمانە پیاون ) .

دانەر دوولایەنی راناوی ئیشاری لە رستە سازیدا بەرچاو نەخستووە واتە وەك دەستۆرێك :

١ ـ لە قالبێ پالپشت ( مبتدا )دا ، وەك : ئەم ـ پیاوە ، ئەوە دارە ...

٢ ـ لە قالبی ووسفی‌دا ، وەك ئەم پیاوە هات ... ئەمەش دیاردەیەکی بێ لایەنانەیە لە زمانەکاندا ، بـــە نموونە لە عەرەبیدا (کـــە دوورە نەژادی کوردی‌یە ) :

« ١ ـ هذا رجل ، ٢ ـ هذا الرجل جـاء ... »

لە باری دووەمدا ، بزوێنی دواوەی راناوەکـەو نیشانـــەی کـــۆ ، دە ترازێتو دەلکێـت بـــە دوای ( مشاراليه ) یەکەوە ، وەك :ـ ئەو پیاو ، ە .

ئەم پیاو ، انە ... هـــەر ئەم لادانەشـــــیە تـی کـە بـــاری دەستوورەکەی چەواشـــە کـردووە تەنانەت کە لەسەر بالاپێوی عەرەبی دەڵێت : ( اذا کان اســـم الاشارة جمعا ، یجب ان یکون المشار الیه جمعا ... ) بەنموونەکەی سەرەوە ( ئەم پیاوانە ئازان ، ئەو بۆچوونەی هەڵ دەوەشێتەوە .

> سەرکردایەتی کردن بە کۆمەڵ ڕێبازی شۆڕش جێگیر دەکات و دەسکەوتەکانیشی دەچەسپێنێ .
>
> « صدام حسین »

**دانەر لە تایبەتی زمانەکەوە ناچێت بۆ دەستور .**

**بە نموونە لە لاپەڕ ە– ۷۹ـدا نووسیویەتی :**

**( لە کوردیدا ، وتەی یەکەم نابێتە سەر رستە (مبتدا) ئەگەر کردە (فعل) یەکی لە دواوە هات ، ئەوسا و تەکە دەبێتە کردار ( فاعل ) وەکو زمانی ئینگلیزي ))**

**ئینگلیزي زمانی ئێمە داناڕێژێت ، بەرای خۆم لایەنی (منطقی)و (بلاغي) کە ( موضوعو محمول )یان مسندو مسندالیە – یان کردوە بە بنکەی رستە ، بۆ ئێمە دەستوورێکی ژیرانەو گونجاوە ، جازاراوەکان چۆن دەکەن بە کوردی بیانکەن ، ئێمە قسە لە زانست دەکەین ۰۰۰!!**

لەم بارەیەوە مامۆستا تۆفیق وەهبیو زمانەوانە فارسەکانو بەلاغییە عەرەبەکان – ئەم رەوتە زیر بێژییەیان گرتووە .

دیسان لادانێکی تری لە زانستی وشەدا :

« تستعمل هذه الأداة (یەك=ێك) للتاكد علی فردیة او نوع او جنس الاسم النكرة »

روونکردنەوەیەك :

ناوی نەشوناس سێ پلەی هەیە :

گەیاندنی رەگەز ( جنس ، گشتی ( استغراق ، تاکی نادیار ( فردیة ) ، وەك ( پیاو = نەك ژن هەموو پیاوێك = بەبێ سەرنجدانی تاکە تاکە . پیاوێك = یەك پیاوی دیارینەکراو .

لێرەدا تەنها بۆ مەبەستی سێیەم ( یەك ، ێك ) لە زمانی کوردیدا دەوری خۆی دەبینێت ، بەڵام دانەر لەم لایەنە زیر بێژییە لای داوە . !!

## رای تایبەتیو هەڵەی ئاشکرا :

**لێرەدا چەند غوونەیەك دەخەمە بەرچاو ، زوربەی زۆریشی بە جێدەهێڵم بۆ بەشوێنکەوتنی – زمانەوانەکان .**

۱ – لە لاپەڕە ( ۸٤ – دا ) نووسیویەتی :

« ئامرازی [ یەك ] بەزۆری لە وەسفکردندا بەکار دێت ، وەك : – پیاوێکی راستگۆ – ... هتد .

– ئەرکی وەسفکردنەکە هی ( راستگۆ ) یەو هیچ پەیوەندی بە ئامرازەکەوە نیە .

**۲ – لاپەڕە (۹۱) : « ناو لە کوردیدا بە (ان) (یان) وەیان بە ئامرازی بەرناسکردن (کان) ئەکرێت ، بە کۆمەڵ ... »**

**– لە راستیدا ئامرازەکە تەنها (ان)ە و لە (یان)دا پیتی (ی) بۆ ترازاندنی دوو بزوێن دێتە کایەوە ، وەك (نانەوا + ی + ان = نانەوایان.**

**دیسان لە [کان]یشدا ، [ك] بەشی ئامرازی شوناسە ، وەك ( نانەواکە + ان ) بە دوستووری پەنجەرە – ە = پەنجەر + ان = پەنجەران جگە لەوەش تاقە مۆرفیمێك لەیەك کاتدا ئەرکی (کۆ)و (شوناس) نابیی .**

۳ – لاپەڕە (۹۸) :

بۆ پێك هێنانی وەپاڵ خستن پێویستە ، وەپاڵ نراو پاشگری بەپیتی (ی ، تی ، ل ، لا ) وە لەیەك باردا a : E بەکار ئەهێنری لە جیاتی (ی) .... » .

– پێویست ناکات لە سەر ئەو کوردییە پەتییە لێهەڵ بچمەوە ، بەڵام لەو دەستوورەیدا چوار هەڵە هەیە :

**۱ – نیشانەی ازافە هەمیشە بزوێنێکی کورتی داکشاوە لە هەرزێکا درێژیش بێت ( ئەو واتەی ) باشکرنیە .**

**۲ – هەستی بەوە نەکردوە ئەگەر کۆتایی (مضاف)ە کە بە بزوێنی بێجگەی (ژ) بوو ئامرازەکە دەبێتە (ی) دەنگدار ، وەك : نانەوای ئێمە ، چەقۆی من ...**

**۳ – نیشانەکە لە کرمانجی خواروودا بە (ی) دەردەبڕێت یان ژێری کورتە یان (ی) دەنگدارە وە لە کاتێکدا (ی) بەدەنگاری ( ی = ا )دا کشاوی د ریژی نسبەتبوو گوناکرێت ، بەڵام دەبێ هەر بنووسرێت وەك[1] :**

**وشەی (شارەوانی = البلدیة ، شارەوانیی سلێمانی = بلدیة السلیمانیة ، ئنجا نووسەران بەرەمەکی خوویان پێوە گرتووەو نیشانەی ازافەکە نانووسن ، لە رێنوسی کۆری زانیاریشدا ،دیسان مرانەوویانەو تەنها (ی) نسب**

**دەهێڵنیەوە : بەهەر حاڵ دانەر لەوێنەی (نەخۆشی ئاولە) بە هەڵە چووە کە دەڵێت ئەو (یّ)یە ( ا )ی وەپاڵ خستنە .**

٤ ـ خاسیەتو شانازی پێکراوی ، دیاردە دێرینە رەسەنەکەی زمانەکەمانی لەبارەی هەندێ قالبی وشەی لێکدراوەوە رووخاندووە ، بەنموونە وێنەی (گولەباخ)ی بە دەستەواژەی ازافی داوەتە قەڵەم!!

**روونکردنە وەیەك :**

**لە زمانە کەماندا هەندێ وشەی لێکدراو لە دەستە واژەی ازافی یان ووسفی یەوە دابەزیون ، وەك (گولی باخ ) یان (سێوی مزر ) . لێرەدا لە دەستەواژە دوردە چن پاشان بە دوو رێژگە خۆیان دادەرێژن: یەکەم بەلابردنی نیشانەی ازافەو جارجار ناویەندی (ە) وەردەگرێت ، وەك ( گوڵ + ە + باخ ) یان لەسەر دیاردەی سەنسکریتی ناوەلناوەکە هەڵ دەچەرخێتەوە ، وەك ( سێوی مزر ) دەبێتە (مزرە سێو ) . دانەر هەستی بەم نهێنی یە زمانی یە نەکردوە ، لەمەوە تووشی ئەو هەڵەیە بووە . من بۆم نیە لەم باسەدا لەمە زیاتر لە سەری برۆم . . .**

**ئاوڕدانەوەیەك :**

دانەر بەشێکی زۆری کتێبەکەی تەرخان کردوە بۆ ـ باسی وشەی لێکدراوو چاوگی لێکدراو ، بیجگە لە شێوانو روالەت کاری ، زانستانە بۆی نەچووە .

هەر ئەوەندە هەڵ دەگرێت ، بۆ باری سەرنجو بەکورتی ئەم رایەی بخەمە روو .

بەر لە چاپدانی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەی ، کاك احمد لەلاپەرە (٣١٩)ی گۆڤاری کۆری زانیاری کورددا ، بەرگی سێیەم بەشی یەکەم ـو تارێکی بلاّو کردووەتەوە ، لە کۆتایی یەکەیدا دەڵێت :

« من لەو با وەڕەدام کەژمارەیەکی زۆرمان لە وشەی لێکدراو هەیە ، دەبێ بەسادە بژمێررێن ، لە زمانی ئینگلیزیشدا بە سادە دراونەتە قەڵەم ، وەك ئەم وتانە بەنموونە : گامێش ، مامۆستا ، شەو گەرد ، گوێسوانە . . . هتد .

کە ئەمە باری بۆچوونی دانەربێت هیچ پێویست نیە کە لەم دیاردەیەدا کتێبە ئەکادیمی یەکەی هەڵ سەنگێنم !!

**لە رووی وشە سازیو گەردانەوە :**

**رای تایبەتی هەیەو لە گەڵ زانستە زمانی یەکان ناگونجێت ، بە نموونە :**

**١ ـ کۆمەڵە پیتی [ەوە] ـ ئەو واتەنی ـ ، لە وێنەی ( بەرین ـ بەرینەوە ، گێران ـ گێرانەوە . . . پاشگرینەو لە ئەسڵو جەزری چاوگەکەیە !!**

٢ ـ لە لاپەرە (٢٣٣)ی کتێبەکەیدا ، دەڵێت :

« دو پیتی (ێر)و دوپیتی (ەر) وەك : ـ(١)

بجوول + ێر + ەوە = بجوولێرەوە.

بخوێن+ەر + ەوە = بخوێنەرەوە

. . . هتد » .

هێناویەتی چی کروود ؟!

**راناوی (بجوولێ)و ( بخوێنە )ی کرداری داخوازی لە گەڵ بەندە فۆنیمی (ر)دا جۆشداون ، باری زانستانەی نەپیکاوە ، کە بەم شێوەیەیە :**

**کۆتایی (بجوولێ) ؛ بزوینە ، لە کاتی لکانی پاشگری [ەوە] دا ، دوو بزوێن بەرەنگار دەبن ، کورد لەم فۆرمانەدا ، ئەو دو بزوێنە بە (ر) دەدەترازێنیت ، واتە ( بجولێ + ر + دوە ) بخوێنە + ر + ەوە .**

**بارەیەوە درێژەم بەچەند وتارێك داوە .**

**ئەگەر ئەم یەرەنگاری یەش نەبوو هیچ پێویست بە ناوبڕناکات وەك ( برۆن + ەوە = برۆنەوە ) .**

٣ ـ ل ٢١٥ی کتێبەکەی : « ان اداة المصدر ، حرف (ن) فی بعض المصادر المرکبة تقع بداخلها » .

پەراوێز :

تائێستا کورد شتی وای بەرهەم نەهێناوە ، کە (ن)ی چاوگ ناو قەدی بکرێت ، ئەم قسەیەش بۆ یەکەم جارە ، ئەگەر نموونەشتی بە دەستەوەیە ، با بفەرمێت !!

**٤ ـ لادانێکی تری لە زاراوەدا .**

**ا ـ وشەی [ کردە ]ی داناوە بۆ ( فعل )**

**ب ـ وشەی [کردار ]ی داناوە بۆ (فاعل ) .**

**واتە (فعل) کە (حدث)ی رووتە کردوویەتی بە ( ذات ) یان بەلێبدانە ودیەکی تر (ئیشی کردوەبە ئیشکەرو (ئیشکەر) یشی کردوە بە (ئیش) !!**

**بۆ باری سەرنج : کورد دەڵێت : ( کردەی منو بردەی تۆ ) یان فلانە کەس کردەیە ، فلان ( کردار)و (رەفتار)ی باشە .**

**تەنها بەو نموونانە واز دەهێنم ئەگینا بەشی کردنەوەو بەراوردی ئەو دو رێژگەیە لە فارسیو کوردیدا ، زۆری دەوێت . (( کاتی خۆی لە گۆڤاری دەنگی مامۆستادا ، برێکم لێ روون کردوەتەوە )) .**

شێوازی رێسەو ئێچڕان لە کتێبەکەدا :ـ

بە نموونە : بابی شەشەمی کتێبەکە ( ناوی گەیەنەر = اسم موصول ) ـ :

**١ ـ ١٦ ـ لاپەرەی قەبارە گەورەیە .**

٢ ـ سەدو بیست و هەشت

> رزگارکردنی ئافرەت ئامانجێکی بنەڕەتی یە لە ئامانجەکانی حزب و شۆڕش.
> «صدام حسين»

نموونەی بۆ هێناوەتەوە ؛ بە میساڵە عەرەبی‌یەکانەوە دەکاتە (٢٥٦) دوسەدو پەنجاو شەش میساڵ .

٣ ــ بەو حاڵەش راناوی گەیەنەری لە راناوی کەسی سێ‌یەم و راناوی نیشاری جیا نەکردوەتەوە .

٤ ــ بەو هەموو تێچڕانەوە ، بە پێی زانستی وشەسازی بۆ ئەو مەبەستە ، تاقە رستەیەکی شی نەکردوەتەوە !!

**شێوەی راهێنانەکانی :**

**دوای هەرباسێك ، هەر نموونە بەدەستەوە دەدات (من چیم کردوە تۆش وەها بکە ، بۆ نموونە !**

**١ ــ ل ١٨٦ ــ تمرن على الموصول المضاف(١)**

**٢ ــ ل ١٨٤ لەسە ئەم دەستوورەش مەشق‌بکە ... هتد .**

تێکدانی‌زاراوە چەسپاوەکان :

دانەریش وەك زمانەوانەکانی‌ترمان لیستە زاراوەی تایبەتی خۆی‌ساز داوە ؛ ئەوەی جێی گلەیی‌یە دەبوایە بەپێی زانستی وشە ، بابەتە تازەکانی پێ بسەلماندینایە ، بێتو عەرەبی‌یەکەیان بە پاڵەوە نەبێت کەس تێیان ناگات تەنیا بۆ باری سەرنج چەند نموونەیەك دەخەینە بەرچاو

| زاراوەی دانەر . | بەراوێری ڕەخنەگر . |
|---|---|
| ١ ــ ڕێگە | بۆ (نیشانە) نەبێت ! |
| ٢ ــ دابڕ (مقطع ) | هەڵەیە ، بەو حیسابە (قاطع) دەگرێتەوە |
| ٣ ــ دارێژ (صيغة) | هەڵەیە بۆ ( الصائغ ) دەبێت . |
| ٤ ــ گشتی ( نكرة ) | هەڵەیە |
| ٥ ــ نەبوون (لا) | هەڵەیە |
| ٦ ــ جێ‌گری کردار (نائب فاعل ) | کورد ئەم بابەتەی ساز نەداوە |
| ٧ ــ کاتی ئێستا ( فعل كينونة ) | کات ، قەوارەی نیە ، هەڵەیە . |
| ٨ ــ نەژوە | بۆ لە (ڕێنووس) لای داوە !! |
| ٩ ــ وەژەك ( نثر ) | بۆ لە ( پەخشان ) لای داوە !! |
| ١٠ــ نەبوژەن (الاسم المادي ) | ئەگەر عەرەبی‌یەکەی لەتەکا نەبێ ، بە (شمشاڵ) زەن دێتە بەر گوێ ؟ |
| ١١ــ بژۆن (واثابي ) | دەبێ لە چی‌یەوە هاتبێت ؟! |
| ١٢ــ وەپاڵ خستن ( الاضافة ) | زۆر ناقۆڵایە . !! |
| ١٣ــ کۆژ ( العبارة ) | لە چی‌یەوە هاتووە ؟ |
| ١٤ــ ئاژەری ( تملك ) | لە چی‌یەوە سەری هەڵداوە . |
| ١٥ــ هۆکەر ( ظرف ) | بەپێی کێشی (نان‌کەر) ئەوکەسە دەگەیەنێت کە ( هۆ ) دروست دەکات !! |

ئەمانەو دەیان و سەدانی‌تر لە بەرهەمی دانەرو زمانەوانەکانی ترمان ، بە حیسابی سافیلکەکان ، گوایە ئەمە دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی‌یە ؟!

بەڵام بەهەڵە بۆ ئەومەسەلەیە چوون ، تازە قوڕەکریان خەست‌کردو زمانەکەیان تووشی مەرگەسات‌کردو بڕایەوە ؟!!

ئا بەم حاڵەوە ــ لافی دانانی ئسپرانتۆی زمانی کوردی لێ دەدەین ..

دواسەرنج :

**ئەولایەنانەی کە بەدەست نووسەکەی دانەردا چوونەوە ، (وەك خۆی دەڵێت ) بەبڕوای منو هەموو کەس جێی گلەیین . دەبوایە دڵسۆزانە ، یارمەتی کاك ( احمد حسن ) بدەن .**

**ئەوەش بەدی دەکرێت کە دانەر ، نیازی پاکەو خۆی رەنجاندوە لە پێناوی خزمەت‌کردنی میللەتەکەیدا.**

---

**(١) ئەم رایەی لە ئیشتباهەوەیە ئەگینا ( اسم موصول ومضاف ) جێی تێڕامانە ؛!**

# هەرزەکارو ئەرکی دایك و باوك و مامۆستا...

پاساکانی گەورە بوونو گەشەکردنی ئادەمیزاد لەو کاتەی کە ئیمبریۆیە واتە (Embryo) (جنین) ە تاکو دەبێتو پیر دەبێ هەموری وەکو زنجیرەیەکی پێك بەستراونو بە کۆمەلێك قۆناغ دا ئەروات کە هەریەك لەمانە نیشانەو روخساری تایبەتی خۆی هەیە لەگەل ئەوەدای ، ئەمە لەلایەك وە لەلایەکی کەوە هەر قۆناغە شوێنەواری خۆی بە چاكو بەخراپ بەپێی چۆنیەتی پەروەردەکردنی منالەکە بەجێ دەهێلێ .

لێرەدا من تەنها قۆناغی هەرزەکاری وەردەگرم و بەکورتیو خەستی لێی دەدوێم چونکی لێدوان لە هەموو قونا‌غەکان کتێبێکی گەورەی دەوێتو لەم بوارەدا ئەمە ناکرێت . ئومێد دەکەم بایەخو گرنگیو ناسکی ئەم پلەیە بەشێوەکی ئەوتۆ بخەمە پێش چاوی هەموو خوێنەرانی خوشەویستی کوردەزمان وە هەریەکە بەپێی شوێنی خۆی سوودی لێ وەربگرێ بەتایبەتی ئەوانەی لێپرسراوی هەرزەکارانن لەبەر ئەوەی ئەم پلەیەی ژیان تا رادەیەك دوارۆژی ئەندامەکە لەناو کۆمەل دیاری دەکات .

نەزانین رەفتارکردن لەگەلیان بووەتە هۆی گەلێ گیروگرفت لەرێگای ئەم بێتاوانەو کۆسپی بۆ دروست کردوە چەندان لە قوتابخانەکانیان دوور کەوتونەوەو لە دایكو باوکیان زوێر بوونو مالیان لی کراوە بە دۆزەخ لەئەنجاما تووشی گێژاوی کووچەو کۆلانان بوون . جا لێرەدا پرسیارێك خۆی هەلدەداو ئەلێ : ئایە ئەگەر سەرەنجامی هەرزەکار لە مالەوەو لە قوتابخانە وابێت دەبێ لە کووچەو کۆلان باشتر بێت ؟!

بێگومان نەء ئەوەشمان لەبیر نەچێت لە کومەلگای سێیەم واتە کووچە هەندێ دەستەی بەدخوو و زیرەك هەن بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان لە کەمیندان بۆ قۆزینەوەی ئەم هەرزەکارانەو بە ئارەزووی خۆیان مەرامی لاوی‌یان دەهێننە دی کاتێك بە ئاگا دێنەوە کە کار لەکار ترازاوە ...

جا بۆئەوەی بتوانین زۆر بەووردیو ژیرانە رەفتار لەگەل لاوی ئەم قۆناغە بکەینو دووریان بخەینەوە لە دووچاری رێزپەری واتە ( الشذوذ ) وە دوارۆژێکی باشیان بۆ مسۆگەر بکەین دەبێ لەپێشەوە بزانین کە لەم پلەیەدا گورانێکی بە خێرای‌یان بەسەرا دێت بەلام لەکچا ئەم گۆرانە زووتر دەبێت وەك لە کوردا ئەم گۆرانانەش لەلایەن هەردو لایانا دەبنە مایەی بێ ئارامی‌یان و بزرکردنی هاوسەنگیان تارادەیەك گۆرینە - کانیش لە رووی فسیۆلوجی‌یەوەو لەش‌یەوە دەبێت ، خۆ ئەگەر ئەم گۆرینەیان بۆ شی نەکرێتەوەو تێیان نەگەیەندرێ وە رەفتاری جوانیان لەگەل بکەین ئەوا لەئەنجاما دەبنە قوربانی بۆ نەخۆشیە سایکولۆژی یەکان واتە نەفسی . هەرزەکار رەنگو روخساری ئەگۆرێ لەناوەوەو دەرەوەی لەش . گۆرانی خێرای بەسەر دادێو هەندێ لە رژێنەکانیان ( الغدد ) ئاوەکانیان دەرێژنو دەبنە هۆی لادان لە ئاسێ گەورەبوون بەشێوەکی سروشتی بۆ وێنە رێژەی گەورەبونی دل زیاترە لە رێژەی گەورەبوونی بۆری‌یەکانی خوێن ئەمە دەبێتە هۆی زۆر بوونی پەستانی خوێن ، هەندێ جار رشەی هەنجنینو مژینی خواردەمەنی ( جهاز الهضم ) کارەکان نارێك دەبن لەبەر بێ ئارامی هەرزەکار ئەم نارێکیە دەبێتە هۆی پەیدابوونی زیپکە لەسەر روومەتەکان و ناوچەوانی هەرزەکار لە ئەنجامی ئەم گۆرنیانەش تووشی کەم خواردن دەبیو ئاگای لە وانەکانی قوتابخانەی نامێنیو بەزووترین شت هەلدەچێو هەستەوەر واتە (حساس) دەبێت وای لێدێت هاوسەنگی خۆی بزر

دەکات وە لەهەمان کات لەخۆشی رانابینێت ئەم گۆڕینانەی بەسەری هاتووە بۆ کەسی باس بکات بۆیە هەوڵ دەدات پەنابیاتە بەر ئەم رەفتارانەی خوارەوە بۆ بەرگری کردن لە بێهاوسەنگی خوی‌و هەر لایەنێکی لەم ڕەفتارانەی کەبی گری بەتووندی‌و زیێدە لە پیویست جێبەجێیان دەکات ئەگەر راوێژکەری نەبێت ئەنجامەکەی باش نابێت .

١ ــ دوورە پەرێزی‌و گۆشەگیری
لەبەر ئەوەی هەرزەکار رەنگ‌و روخساری گۆڕاوە‌و گۆڕاوی ناوەوەشی لێ بەدەرکەوتوە هەردەم هەوڵ دەدا دوور کەوێتەوە لەناو دۆست‌و برادەرو کەس‌و کاری .

**٢ ــ نەسەلماندن و لاساری :**
بۆ گەڕانەوەی بڕوا بەخۆ کردن‌و هاوسەنگی خۆی هەردەم ئارەزووی لە مجادەلە دەبێت‌و ناسەلمێنی‌و وە لە وەلام وانەوەوی ئیش‌کردنا لاسار دەبێت‌و هەردەم گرژ دەبێت‌و دەچێتەوە باریەك .

**٣ــ لاساکردنەوەی مامۆستاکانی‌و هەر لێپرسراوێکی هەیەتی :**
بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەم بێ ئارامیەی و دابین نەبوونەی .

**٤ ــ گرتنی لایەنی ئاینی :**
زۆر لە هەرزەکاران دەست ئەکەن بە نوێژکردن‌و خوێندنەوەی کتێبی ئاینی ئەم لایەنە باشە ئەگەر چاك ئاراستە بکرێ دەنا ئەنجامەکەی بەێمەوانە ئەبێت .

٥ ــ شۆڕش‌نانەوە ، یان‌سەر ــ کردایەتی کردنی کۆمەڵ چاك کردنی جیهانی بەهێوای تۆلە سەندنەوە چونکی دەبینێ لە هیچ لایەك رەفتاری چاکی لەگەلا ناکرێت بۆیە زۆر لە پارتەکان یان کۆمەلەکان هەولی ڕاکێشانی لاوی ئەم قوناغە دەدەن‌و ئامانجەکانی خۆیانیان پێ دەهیننە دی . لەگەڵ ڕەوشت‌و ڕەفتاری کە وەك خەونی ئاگایی و پەلپ گرن لەگەلێك شتا .

ئەمەیە لاوی هەرزەکار جا لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕەفتارو ڕەوشتانەی دەبێ هەموولایەك هەوڵ بدەن خۆیان شۆڕکەنەوە بۆ ئاستی ئەم هەرزەکارە بێتاوانە وە پلان‌و ڕێگای دروست دانیێن بۆ گوستنەوەیان لەم قۆناغە سامناکە تە قۆناغێکی کورتە بەلام شوێنەواری کاری گەرە ، بەلای منەوە دایك‌و باوك یان براو خوشکە گەورەکان هەوڵدەن ببنە هاورێیان‌و شەرمیان لێك بشکێ ئەم گۆڤارو وێنانەی هەرزەکار بەکاری‌یان دێنێ لەگەلیان بخوێننەوەو تەماشای بکەن نەك لێیان قەدەغەیکەن ، سینگیان فراوان بێت بەرامبەریان ئەرکیان گران نەکەن هەرزەکار هەستیارە نەکەن ووشەیان لەزرابێتە دەر هەستیان بریندار کەن ، هەندێ ڕەفتاری نالەبار دەکا هەرچەندە دەیانبێنی واینشان وا نەی دیوە لەلایەکی ترەوە بدوێ ، گەر لە قوتابخانە سەرنەکەوت نەی‌شکێننە ــ

وەو سەرکۆتەی نەکات داخوازی‌یەکانی بەپێی توانا بۆ جێبەجێ بکات‌و هەوڵدات ئەت‌وقەت ڕاستەوخۆ ئەرمانەکانی ڕەت نەکاتەوە تا لە توانایدا هەیە لایەنی هاندان‌و لەسەرخۆیی لەگەل پەیڕەو بکرێت .

بێگومان لە قوتابخانە ئابەم ئەم پلەیە زۆر دەدرێ و گرنگی پێدراوە مامۆستای شارەزا لە توانای دایەیە هەموو سەرنجی لاوەکان بۆخۆی ڕاکێشی‌و بە چاکی ئاراستەیان بکات بەلام ئەگەر هات‌و ئەرکی گران کردو لە تاقی‌کردنەوە خستی ئەوە دووچاری تەنگوچەلەمە دەبێت لەبەر ئەوەی قوتابی ئەم قۆناغە ماندودو لە هەموو کارەکانیدا خاوە جا چ لە رووی ئامادەکردنی وانەکانی ئەگەر لەوانەیەك ٢٠ نمری وەرگرت لە سەدا ، مامۆستا بۆی بکاتە (٥٠)و تێی بگەێنی‌و بەچەند ووشەیەکی شیرین و جوان وە بە شێوەکی گشتی لەم قوناغە بدوێ ئەوە قوتابیەکە زۆر دلی خۆش دەبێ‌و دەبێتە هاندەرێك بۆیان چونکی قوتابی ووشەی مامۆستا کەی بەهەند هەلدەگرێ‌و ماوەیەك پێوەی خەریك دەبێ جا بە ئاگا لێك بوونی مالەوە لەگەل قوتابخانە لە لاوی هەرزەکار بەهەردوو لایان زاڵ ئەبن بەسەر بەدخووەکانی کووچەکان‌و هەرزەکار رزگاریان ئەبێت لە چەنگیان‌و رێبە ڕاستەکەی خۆی ئەگرێتە بەر . خۆ ئەگەر مالەودو قوتابخانە ئاگایان لێك نەبێ‌و هەریەکە بەلایەکا بڕۆن‌و ڕاستی ئەم قۆناغە بە دروستی هەلنەسەنگێندرێت مامۆستا نمرەی هێوا بری بداتێ‌و لە هەردوو لاوە پشتی تێبکرێ‌و چارەسەر خۆی بێکا دەبێ دەست لەم بێتاوانە بشۆین‌و دوا ڕۆژی ئەم ئەلەندەرە خۆتان دیاری بکەین . ــ

**سەرچاوەکان**

**سرود لە ووتارەکەی دکتور جواد** الحسینی وەربکراوە .

# سایکۆلۆژی ئافرەتی رۆشنبیر

دەڵێین ئافرەت نیوەی کۆمەڵە ، بەڵام دەتوانین بڵێین بڕبڕەی پشتی کۆمەڵە و مەزنترین دەستکردی خوایە ، ئەگەر بزانێ رێز لەخۆی بگرێ ، چونکە ئەو بنیات نەری خێزانێکی بەختەوەرو ئابروو مەندەو منالەکانی لەسەرڕێبازی هونەرمەندیو خۆشەویستی و ئاسایشی بۆ گشت مرۆڤایەتی بەخێو دەکات ، ئایا « ناپلیۆن » نالێ : « ئافرەت بەدەستێکی لانەدەهاژێنێ و بە دەستەکەی تری جیهان دەهاژێنێ ؟ »



* یعقوب قصاب *

ئافرەتی ڕۆشنبیر سەربەست وسەر بەخۆیە . بەڵام بەشان و شکۆو شێوازە ، ئەو خۆی لە بەندی پێچەی دەروون دەرباز کرد ، بەڵام بە ئابروو و سەنگینی و گرانیەوە هەست بە ئۆباڵی سەرشانی دەکات و لەکارو فرمان بەشداری کۆمەڵ دەکات و بەرهەم دەهێنێتە کایەوە ، خۆی پەروەردە دەکات و هەردەم ئامادەیە بۆ ئەوەی شان بداتە بەر زیان و بەرەنگاری ناخۆشی ببێ بەبێ ترس و لەرز ، لەنەریتی و ڕەفتاریدا هۆشمەندە ، خووازتنی بەهێزە و باوەڕی بەخۆی هەیەو متمانەی پێ دەکات ، ئێمەش دەبێ هانی بدەین شەرم و هەست بە کەم بوون نەکات ، هەروەکو دوکتور « زکریا ابراهیم » دەڵێ : « با تەماشای ئافرەت بکەین کەوا پێش ئەوەی ئافرەت بێ ، مرۆڤە چونکە نەژادی مرۆڤایەتی لەلای هەر دوو ڕەگەز یەکە هەرچەندە هەندێ جیاوازی ئۆرگانی لەنێوانیاندا هەبێ » .

ئافرەتی ڕۆشنبیر هەست دەکات کەوا نیازو ئاواتی لەناو قەوارەی خێزان هاتوونە دی ، چونکە بە ڕێڕەوی هۆش و دڵ و دەروون شووی کردووە ، هەر لەبەر ئەمەیە هەست بە ڕەزامەندی و چاو تێری و ئاسوودەیی و جێگیری دەکات « خۆشەویستی خۆراکی دەروونە چەندە خۆشەویستی لەماڵبەندێکدا هەبێ ئەوا ئەرمۆمەتری بەختیاری زیاتر تیایدا گەشە دەکات » .

ئافرەتی ڕۆشنبیر ڕووخۆش و دڵ ڕوونە ، دۆخێکی پڕ لە هێمنی و خامۆشی و ئاسوودە دەسازێنی ، بە ڕووخسارێکی گەشبین پێشوازی مێردەکەی دەکات ، ئەویش هەرچەندە تووشی ماندوو بوون و گەرداوی ژیان هاتبێ بەم ڕووخۆشی یە لەبیری دەچێتەوە هەر وەکو ووتراوە : « شیرین ترین شت لەزبانا زەردەخەنەی سەر لێوی ئافرەتی خۆشەویستە . » . هەر دەم شانازی بە مێردەکەیەوە دەکات و چاو لەکەم و کورتی و نەنگی دەپۆشێ و ڕێزی دەگرێ و ڕەخنەشی لێ دەگرێ ، ڕەفتارو ئارەزوو وەڵام دانەوەی سۆزیان لەیەك ئەچن ، بە لێ گەیشتن هەموو گیرو گرفتیان تەخت دەکەن ، وە بۆ زاڵ بوون بەسەر هەموو تەگەرەیەك دا هەردەم هانی یەکتر دەدەن و بۆسەر کەوتن لەژیاندا پشتی یەکتر دەگرن ، لەلای یەکتر پا یەو بەهرەیان دەبێ ، لەم بارەیەوە « ئادی کانتۆر » دەڵێ : « من زیاتر لە هەموو مرۆڤێك ئەرداری هاوبەشی ژیانم . بۆ بڕینی ڕێگام لەژیاندا ئەو پشتگیری کردم ، هەموو شتێکی سپی بۆ ڕۆژانی ڕەش پاشکەوت دەکرد ، زۆر بەچاکی منداڵەکانمی بەخێو کرد ، خۆ ئەگەر ئێستا گەیشتوومەتە پایەیەکی بەرز هەر بە هاندانی ئەو بووە » .

زانایان بۆ گواستنەوەی کەلەپووری خووڕەوشت لە باب و باپیران بۆ منداڵیان میرات بە گرنگ دادەنێن و دەڵێن : « زگماك کەرەستەی خاوە ، دەورو بەریش پوختی دەکات . کەواتە ئافرەتی ڕۆشنبیر مافی بەهای ژیان لەتەندروستی باش و ژیری بۆ منداڵانی دەگوێزێتەوە . وە داوێن پاکی و ڕەفتاری باش و بە ئابروویی‌و ژیان نامەی پاکیان فێر دەکات ، بە یاریدەی باوك پارێزگاری بنچینە کۆمەڵایەتی‌یەکان ، هەردووکیان لە سەر یەك ڕێبازی پەروەردە ڕێك دەکەون ، ئەوسا منداڵیشیان مۆرکی تایبەتی ماڵ وەردەگرن هەروەکو ووتراوە : « گیا لە سەر بنچی خۆی شین دەبێ » .

سۆزو میهری دایك بۆ منداڵ دەرمانن ، بۆ نموونە فێری بەزەیی و خۆبەخت کردن و خوشەویستی‌و نەریتی باش دەبێت ، لەم بارەیەوە « بستالۆتزی » دەڵێ : « دایك سەرچاوەی هەموو پەروەردەیەکی ڕاستەقینەیە ، یەکەم ڕابەرە بۆی وەیەکەم قوتابخانەیە فێری ڕەفتاری باشی دەکات » . کەواتە ئافرەتی ئەم چەرخە تەنها کابانی ماڵ نیە ، بەڵکو هاوبەشی ژیانی پیاوە وەهەڤاڵێتی و لە خۆشی و نشوستی‌دا بەشداری دەکات ، بۆ سازبوونی وەچەیەکی ساغ و بەهێز بۆ ژیانی ئایندە بەر پرسیارە ، کاتێ « ابراهیم لنکولن » بوو بە سەرۆك کۆمار ، کە خەڵك پیرۆز باییان لێ دەکرد ئەویش دەیووت : « پیرۆز باییم لێ مەکەن ، پیرۆز بایی لە دایکم بکەن ئەو منی گەیاندە ئەم پایە گەورەیە » .

**سەرچاوەکان**

١ ) الام ودورها في الحياة حامد طه الخشاب وزميله

٢ ) كيف تكسب الاصدقاء وتؤثر في الناس ؟ ديل كارينجي .

٣ ) سيكولوجية المراة د. زكريا ابراهيم

٤ ) مشكلات الطفولة في المجتمع المدرسي جليل شكري عجبان .

* خورشید رشید *

# پەندی پێشینانی کوردی

سەرتایی پەیدابوونی هەموو ئەدەبێکی جیهان بریتی‌یە لە فۆلکلۆر ، وەك دەزانین ئادەمیزاد ماوەیەکی دووروو درێژی لە ژیاندا بریوە بێ ئەوەی بزانێت خوێندن ونووسین چی‌یە . بەلام ڕۆژ بەڕۆژ ئادەمیزاد لە ژیاندا پلەی بڕیوە وپێشکەوتووە وشتی نوی فێربووە . هەر پێویستی ژیان وای لێکردووە زۆر شت دابێنێت هەتا وەکو پێویستێکەی خۆی پێ بە ئانجام بگەێنێ . هەروەها ئادەمیزاد لە سەرەتایی ژیانی یەوە ، بەچەند قوناغێك دا تێپەڕیوەو لەهەر قۆناغیك دا پلە یەك لە ژیان دا پێشکەوتووە، لە دەوری ڕاوچێتی‌دا کە ئەم دەورە لە مێژوو دا پێی‌دەوترێ دەوری ( کۆکردونەوەی خواردن) لەم دەورەدا ئادەمیزاد وەك دڕندە ژیاوە دووربووە لە ژیانی خێزانو نیشت جێی لەم ماوەیەدا تەنها پشتی بەهێزو توانای خۆی بەستوە کەسی بەهاوبەشی خۆی نەکردووە لە ژیان دا . بەلام دوای ئەوەی تووشی مەترسی بووە لە ژیان دا چونکە زۆرجار لە کاتی ڕاوکردندا کە گەشتی کردووە بەناو جەنگالە چڕەکان دا ، تووشی دڕندەی لەخۆی بەهێزتر بووە یا خود کاتی وابووە تووشی کۆمەلێك دڕندە بووە بەتەنها نەیتوانیوە بەرەنگاریان بێت لەم کاتەدا بیری لەوەکردووەتەوە کە بەکۆمەل بۆ ڕاوکردن دەربچن بێ‌گومان لە نێوانیان دا جۆرە گفت‌وگۆیەك هەبووە ئەگەر ڕەمز یا خود وێنەی شتەکە بوبێت توانیویانە لەیەکتر بگەن دوای ئەوەی ئادەمیزاد ماوەیەکی تری بڕیوە لە ژیان . هەتا گەیشتووەتە دەوری کشت‌وکال ونیشتەجێ بوون و پێکهێنانی خێزان

ـەختیوکردنی ئاژال لەم دەورە دا ـمێ ژیانی باشتربووە لە لەوەی پێشووی زمانە کەیشی ڕێکوپێك ربووە لەوەی پێشووی ئەو هاوارو ـیرکە زبرکەی ئادەمیزاد کە دمری‌بریوە لە کاتی خۆش وناخۆشی دا کە لاسایی دەنگەکانی سروشتی کردووەتەوە بریتی بووە لە سەرەتایی ئەدەبەکەی بەلام لە دوای ئەوەی ئادەمیزاد لە ژیان دا پێشکەوتوو . ئەدەبەکەشی شان بە شانی هاتووە چونکە ئەدەب بەستراوە بە گۆڕانی کۆمەلەکەوە ، ئەم ئەدەبە ساویلەکەیەی ئادەمیزادی کۆن بووەتە سەرگوزەشتەی ئەوەکانی باش خۆیان کەبە شەوان لەگوێی ئاگردانەکانیان دانیشـروـ بەسەرهاتی باوباپیریانیان گێراوەتەوە ئەمەوە چیرۆکو سەرگوزەشتە هاتووەتە ناوەوە نەتەوەی کوردیش سەرەتایی ژیانی هەر بەم جۆرە دەستی پێ‌کردووە وەئەو پلانەی ئادەمیزاد لە کون دا بڕیوێتی ئادەمیزاد لە کۆن دا بڕیوێتی ئادەمیزادی کوردیـی بڕیوێتی وەئەدەبەکەیشی شـ ـار بەشانی گۆڕانی ژیانی خۆی هاتووە لە سەرەتاوە بریتی بووە لە چەند ووشەیەکی پچر پچر پێك هاتووە لە دوای دا وەك ژیانی نەتەودی کورد ڕێکوپێك تـربوون ـمـن وئەدەبەکەیشی دەستـ ـی ـە خۆیا هێناوەو باشتر بووە لە وەی ـیشووی . ئەبینن لەسەرەتاوە ئادەمیزادی کورد ئەدەبەکەی بریتی بووە لە شیعر چونکە روونە لە پێش‌هەموو شتێك دامرۆڤ هەست بە ویژدان دەکات وەهۆنراوەیش ئاوێنەی دەربرینی ئەو هەستەی بووە ، تەعبیری لەبیروباوەڕی کردووەتەوە بە هۆی ئەو ئـ‌ـوازە

مۆسیقایەوە کە لە ناو ووشەکانی دا بووە وە لە چەند دێڕێکی کورت پێکهاتووە توانیوێتی بە ئاسانی لە بەری بکات . وەهەر لە بەرئەوەش ئەبینین کە کاتێك خوێندن نووسینی عێراقی کۆن دۆزرایەوە لە لایەن سۆمەرێکانەوە کورد هەر بایەخی بە شیعرو فۆلکلۆر داوە وەك . پەندی پێشینیان وقسەی نەستەق و گۆرانی میللی لای نەکردووەتەوە بەلای هونەری پەخشان کە زمانی ژیرەیە چونکە لەو سەردەمە کۆنە پێویستێکی ئەوتۆی نەبوو بەنووسینی‌ی درێژکە بەشێوەی پەخشان بینوسێت ؛ بەخشان پەرەدەسەێنێتو کە باری کۆمەلایەتی وئابوری وسیاسی وفراوان بێت ئەو کاتە شیعر ناتوانێت چارەسەری ئەمانە بکات تەنها پەخشان نەبێت . وەهۆیەکی ئەوە زۆرتر حەزیان لە شیعرو وپەندی پێشینیان کردووە چونکە توانیویانە لەبەری بکەن ئەمە کورتەیەك بو لە ژیانو بەسەرهاتی ئادەمیزادی کۆن وچۆن ئەدەبەکەی دەستی پێ‌کردووە . جۆرە ئەدەبێکی هەبووە ئێستاش ئەگەڕێینەوە سەرباسەکەی خۆمان کە ( پەندی پێشینیان)ە وەك سەرەتایی ئەم باسەدا گوتمان سەرەتایی پەیدابوونی هەموو ئەدەبێکی جیهان بریتی‌یە لە فۆلکلۆر .

کوردیش وەك هەموو نەتەوەیەکی ئەم جیهانە نەتەوەیەو خاوەنی زمانی تایبەتی خۆیەتی . خاوەنی کەلپورێکی زۆر دەولەمەندە ئەویش فۆلکلورە بە هەموو بەشەکانی‌یەوە ئەم سامانە بە نرخە لە بەرەبەیانی مێژووەوە شان بەشانی نەتەوەی کورد هاتووەو لقی زۆر لێ‌بوودتەوە وەئەم سامانە بە نرخە یەکێکە لە عەنعەناتی میللەتی کورد ئەوە لە

چونکە ئەدەبی نووسراوی هەر میللەتێك لەسەر فۆلکلۆر دامەزراوە چ شاعیربێت چ نووسەر بۆ بەهێز کردنی نووسینەکەی و ڕازانەوەی دەبێت سوود لە فۆلکلۆر وەربگرێت ؛ چونکە سەرچاوەیەکی دەولەمەندە هەموو کاتێك شان بەشانی ئەدەبی نووسراو دەڕوات . وەك نووسەری بەناوبانگی رووسی مەکسیم گۆرکی دەلێت : ( ئەگەر بتەوێ ئەدەبێکی نەمری بەنرخ بهێنیتە بەرهەم دەبێت لەسەر سامانی فۆلکلۆر دایمەزرێنی وسوود لە هەموو بەشەکانی فۆلکلۆر وەربگریت چونکە دەولەمەندترین سامانە بۆ پێ گەیاندی ئەدەبێکی بەرز) . وەلە فۆلکلۆریش دا پەندی پێشینیانو قسەی نەستەق بە کۆنترین دادەنرێت پەندی‌پێشینان.

لە هەر ناوچەیەکی کوردستان ناوێکی تایبەتی هەیە بۆ وێنە ، کوردی عێراق ( پەندی پێشینیان ، مەسەلەی پیشینیان ، بێژو پەند )ی پێ دەلێن . کەچی کوردەکانی تورکیاو ئەرمنستانو جورجیای یەکێتی سۆڤیەت ( قسەی باڤان ) یاخود ( مەسەلەو مەتەلۆکی) پێ‌دەبێژن . پەندی پێشنیان بریتی‌یە لە چەند ووتەیەکی کورت پێکەوە بەستراون واتایەکی بەرزیان تێدایە باسی باری کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و خورەوشت‌و جۆری ژیانی میللەتی کورد دەکات. ئەم پەندانەش پاش ماوەیەکی میللی‌یە ، کە خاوەنەکەی میللەت خۆیەتی واتا لە سەرچاوەی نەتەوەی کورد خۆیەوە هەلقولاوە ، وەهەر ئەم گشتی‌یەش لە قسەی نەستەق جودای کاتەوە . چونکە قسەی نەستەق بە زوری خاوەنەکەی دیارە.

پەندی پێشینیان بەواتای عیبرەت‌و ئامۆژگاری دێت . وەئەم پەندانەشی لە ئەنجامی تاقی کردنەوەیەکی دوورودرێژی میللەتی کوردەوە هاتووە ؛ کە تاچ رادەیەك ساردو گەرمی‌و خۆشی‌و ناخۆشیان لەژیاندا بینیوە وە یاخود کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی رژێمەکەوە وەلە ژێرسایەی دا توشی جورەها دەردەسەری بونە هەروەها بەهۆی باری ژیانی هەمە جۆرەیانەوە بە تاقی‌کردنەوەیەکی سەختی ژیان دا تێپەریون کە تیایان دا خاوەن بیری تیژو وریا هەلکەوتووە بۆ ئەو بارەی تێیدا ژیاون‌و توشی رووداوی زۆر بونە هاتووە ، بۆ هەر رووداوێك کە لە کۆمەلەکەی دا رووی داوە پەندێکی بۆ هەلداوە ، لە دوای ئەوەی هەر کارەساتێك یا خود رووداوێکیان توش هاتبێت لە تۆزی ئاشنایەتی لەگەل ئەوەی پێشوودا هەبووبێت ؛ ئەو ئەو پەندەیان بە سەردا ووتووە . پەندی پێشینان میراتی هەموو نەتەوەی کورد بە ووردی سەرنج لەم پەندانە نەخوێندەوار ، ئەگەر خوێندەواری کورد بە ووردی سرنج لەم پەندانە بدات بۆی دەردەکەوێت کە لەرستەیەکی زۆر کورت دا چەند واتایەکی جوان‌و پر مانا دەبینێت . وەك لەم پەندەی خوارەوە کە بۆ وێنە هێنامانەتەوە . کە دەلێت : گویا کابرایەك لە بەهارێك دا دەچێت بۆ لای ئاشنایەکی کە خزمەتێکی زۆری دەکەن ، بەلام لە بەهارێك تردا رێی دەکەوێتە هەمان هەوارگەی پارئەمجارە بەپێچەوانەی جاری پێشوو دەبێت ئەو خزمەتەی بەهاری رابووردووی ناکەن ، ئەمیش لە ئەنجام دا دوای بیر کردنەوەیەکی قوول ئەم پەندەی بۆ هەلداوە ؛ کە هەوار هەر هەوارەی پێشووە .

بەلام بەهارەکەی گۆراوە . هەر پەندێك مێژوو سەرگوزەشتەی تایبەتی خۆی هەیە ، چونکە بەبێ هۆ نەوتراوە ، ئەم پەندانەش وەك ئاوێنە باری ژیان و چۆنێتی ژیان میللەت پیشان دەدات . بەلام نازانرێت ئەم پەندانە لە چ ناوچەیەکی کوردەواری ووتراوە نە چ سەردەمێك دا ووتراوە ، هۆی ووتنەکەی چی بووە . ئەمەش یەکێکە لەو ناتەواوی‌یەی لە پەندی پێشینان داهەیە ئەمەش ئەگەرێتەوە بۆ هەول نەدانی خۆمان‌و خۆماندو نەکردن ونەگەران بە دوای سەرگوزەشتەی ئەو ناوچانەی کە پەندەکانی تێدا ووتراون . ئەگەر بووایە سەرگوزەشتەی ئەم پەندانە بزانرایە ، ئەوە مانای وابوو ئەم پەندانە وەك دیاردەیەکی مێژوویی باری ژیانی نەتەوەی کوردی بە جوانی تێدا دەردەکەوت . یەکێك لە تایبەتی‌یەکانی پەندی پێشینیان ئەوەیە کەبیرو واتایەکی بەرز دەدات بە دەستەوە وەگەل بەباشی لێی تێدەگەن . بەلام لە قسەی ئەستەق دا وانی‌یە ، واتاکەی بەرروونی دەرناکەوێت جاری واهەیە لە شێوەی درکە یاخود خوازە دێت . بەلام ئەگەر بمانەوێت مەبەستەکەی روون بکەینەوە ؛ بەم شێوەی خوارەور دەبێت :

**( کلۆلەی کەوتە لێژی کەس خاسی پێ نایژێ )**

وەك ووتمان ئەم پەندانە بریتین لە چەند ووتەیەکی کورت بەلام واتاو بیرێکی زۆر تێدایە ، ئەگەر لەمە درێژ تر ببوایە ئەوە دەچووە سەر شێوەی مەتەل‌و چیرۆك لە پەند دەردەچوو . ئەم پەندانە بەهۆی ئەو بیرو واتاو ئاوازەی کە لە ووشەکانی دا هەیە جیای دەکاتەو[ە] لە قسەی ئاسایی ، جا هەمانە پەند[ ]لە شێوەی هۆنراوە کە وەزن‌و قافیەی تێدایە وەك ئەم پەندەی خوارەوە :

**( هەتا هاتم بوو هەر هات هاتم بوو**
**کە نەهاتم بوو رووی زوولماتم بوو )**

هەمانە تەنها دارێژراوە بە قافیە بەلام وەزنی تەواوی نی‌یە ، وەك :

**(لە جێی شابازان کوڕ کوڕە وازان)**

وەهەمانە لە شێوەی رستەدا ک[ە] زۆربەی پەندەکان لەم شێوەیەن ؛ وەك : **( چەم بێ چەقل نابێ )** ، هەمانیشە لە شێوەی پرسیار[و] وەلام ، وەك : **( کور چیت ئەوێ ؟ دوو چاوی ساغ )** ئەم پەندانە هە[ر] ئەو کۆمەلە نەخوێندەوارەیە کە لە دێرە زمانەوە پارستوویە وەلە ئەنجامی تێکەل بوونیان بە کاروبار[ی] رۆژانەوە ئەو کۆسپو تەگەرەیەی ک[ە] هاتووەتە رێگایان لە ژیان د[ا] لە ژیان دا توانیویانە بەو بیر[ە] ساکارو ووردەی خۆیان عیبرەت و ئامۆژگاری لە ژیان وەرگرت[ن] پەندێکی بۆ نهێنەوە تاوەکو ببێت[ە] یاسایەك بۆ نەوەکانی پاش خۆیا[ن] کە عیبرەتی لێ‌وەرگرن‌و پەیرەو[ی] بکەن ، هەر لەبەر ئەمەش ئەبینی[ن] ئەم پەندانە زۆرتر لە نا[و] خوێندەوارەکاندا بلاوە ب[ە] تایبەتی لە لادێکان وا هە[ر] کەسێکیان بدوێنی چ پیاو بێت[ ]ئافرەت لەناو قسەکانی دا چەن[د] پەندێکت بۆ دەهێنێتەوە بۆ بتەوکرد[ن] وسەلماندی قسەکەی . وەل[ە] ووتارەمان دا چەند تەعریفێك دەخین[ە] بەرچاوی خوێنەواران هی ئەوانە[ی] کە تا ئێستا لەسەر پەندی پێشینیا[ن] نووسیویانە وتەعریفیان کردووە

مامۆستا عەلادین سجادی بەم شێوەیە تعریفی پەندەکانی کردووە ، **( پەندی پێشینیان عیبارەتن لە چەند قسەیەکی کورتی کوردی پێکەوە نووسراون مەعنایەکی بەرزیان تێدایە ، لە زەمانێکی زۆر کۆنەوە کەوتووەتە سەر زمانی کوردی ، چۆنیتی ژیانو رەوشتو بیرو بلوەریان چ لە بارەی سیاسیو کۆمەلایەتی ، چ لە بارەی رەوشتی خێزانو کەینوبەینی تێکرایی ، چ لە بارەی دەولەمەندی و هەژاری پایەی دونیایی دا پیشان ئەدەن ) .**

مامۆستا شێخ محەمەدی خال بەم جۆرە تەعریفی کردووە ، دەلێت **( پەندی پێشینیان ووتارێکی کورتی رێکو پێکو جوانی بەتامی بە تەوژمی بەتینی کاری گەری کەلە دلو دەروونێکی ئاوەدانی ئاگاداری پێشینیانەوە هاتووەتە دەرەوە لەپاش بەراووردو تاقی‌کردنەوەیەکی دوورو ودرێژ پەندی پێشنیان کەلەپوورێکی ئەدەبی‌یە باو باپیرمان لە هەزار سالەوە بۆیان بەجێ هێشتوویی .)**

لە کتێبی ( قسەی ـ ئەستەقو پەندی پێشینیانی نەتەوەکانی رۆژهەلات دا ) کە لە لایەن ( قەنانی گوردۆ ) وەگوراوەتە سەر زمانی روسی بەم جۆرە باسی پەندی پێشینیانی کوردی دەکات ؛ **( یەکێکە لە هونەرەکانی خەلك ، بەبێ ئەوەی نووسرابێتەوە ووتەیەکی کورتە بە زۆری کێشو قافیەی تیادایە )**

ئەم پەندا لەوانەیە دوای ئەوەی کورد لە دەوری کۆچەرایەتی‌یەوە گەیشتووەتە دەوری نیشتەجێ بوون ودەست‌کردن بە کشت‌وکالو ئاژەل بە خێوکردن پێك‌هێنانی ژیانی خێزانی رووی دابێت ؛ کە کەوتووەتە ناو شارستانێتی‌یەوە گیروگرفتی زۆرتربووە لە سەردەمەکەی پێشووی وەلە هەمان کات دا کەوتووەتە ژێر سایەی رژیمەوەی دەرەبەگایەتی بێت . وەبە درێژایی ئەو چەرخانە میللەتی کورد زۆر گیروگرفت هاتووەتە رێگای وەلە سەردەمی ئەوان دا وەك ئیستا نەبووە کە هونەری پەخشان پەرەی سەندووە تاوەك ئیستا بیرو باوەری خۆیان لە شێوەی ووتار دا دەربڕن . لە بەر ئەوەی ناچار بووە بەم ووتە کورتانە کە پێ‌ی دەلێن پەند ، بیرو باوەرو زروفی مەوزوعی‌و واقیعی سەردەمەکەی خۆیان بە جوانی تێدا تۆمار بکەن .

پەندی پێشینیان وەك هۆنراوە بایەخی پێدراوە لە ناو میللەتی کوردا وەشان بەشانی هۆنراوە رۆیشتووە ، چونکە ئەو سۆزو ئەندێشەیە کە لە هۆنراوەدا هەبووە لەمەش دا هەبووە ؛ هۆنراوە زۆرتر کاری کردووەتە سەر هەستی میللەتەکە بەلام ئەم زۆرتر کاری کردووکە سەر بیرو باوەریانو وورباپانی کردووەتە وەلە ژیان دا ، لە پەندی پێشینیان دا زۆر بە مەبەستی واتاو حیکایەت دی . ئیستایش دێینە سەر ئەوەی بزانین تا ئێستا کێ دەربارەی پەندەکان نووسیویەتی چ بە شێوەی پەرتووك وەچ بەشێوەی‌و وتار لە گۆڤارەکان دا . وەك ئاشکرایە باس‌کردن ولێکۆلینەوە لە سەر ئەم بەشە مێژووەیەکی کۆنی نی‌یە وەك بابەتەکانی ئەدەب دەست‌پێ‌کردنو لێکۆلینەوە لە سەر پەندی پێشینیان دەگەرێتەوە بۆ ناوەراستی سەدەی بیستەم وەلەپێشان دا لەلایەن رۆژهەلات ناسەکانی ئەورووپاوە دەستی پێ‌کردووە . ئەویش لە رێگای ئەو ئەرکانەدە کە حکومەتەکەیان پێیانی سپاردبوو لە ناوچەکانی کوردستان دا لە پال کارەکەی خۆیان دا کۆمەلێك تیکستی فۆلکلۆری کوردیان کۆکردووەتەوە یەکێك لەو بەرهەمە فۆلکلۆریانە پەندی پێشینیانە . ئەمەش ئەو رۆژهەلات ناسانەن کە بە شێوەی کتێب باسی پەندی پێشینیان کردووە :ـ

ـ کتێبەکەی ( لێرح ) لە سالی ١٨٥٧ ، بە زمانی ئەلمانی‌و رووسی .

ـ کتێبەکەی ( ژابا ) لە سالی ١٨٦٠ ، بە زمانی فەرەنسی .

ـ کتێبەکەی ( پریم ) و ( سوتین ) لە سالی ١٨٨٧ . بە ئەلمانی .

ـ کتێبەکەی ( ئۆسکارمان ) لە سالی ١٩٠٤ ، بە ئەلمانی .

ـ کتێبەکەی ( هۆگۆ ماکاشی ) لە سالی ١٩٢٦ . بە ئەلمانی .

ئەمانەی سەرەوە ئەو رۆژهەلات ناسانە بوون کە باسی پەندی پشینیان کرددوە .

وەلە نووسەرانی خۆمانیش چ بە لێکۆلینەوە یاخود لە شێوەی کۆکردنەوەو لەسەر نووسیی ئەمانەی خوارەوەن :

ـ مامۆستا ( ئیسماعیل حەقی شاوەیس) کە بۆ یەکەم جار کۆمەلی پەندی پێشینیان کۆکردوەتەوە وبە پێ‌ی ناوەرۆکی پەندەکە جیایانی کردووەتەوە لە سالی ١٩٣٣ لە چاپخانەی ( ئەیتام ) لە بەغدا لە چاپی داوە کە ٦١٣ پەندە .

ـ ( هەزارە بێژو پەند ) لە لایەن مامۆستا ( مەعروف چیاوك ) ەوە کۆکراوەتەوە وەلە چاپخانەی ( نجاح) لە بەغدا لە سالی ١٩٣٨ لە چاپ دراوە . ئەمیش بریتی‌یە لە هەزار پەند ، وەلە گۆڤاری گەلاوێژ دا ناو بە ناو ٩٣٢ پەند چاپ کراوە . هەروەها لە گۆڤاری دەنگی گیتی تازەو دیاری لاوانیشدا ١٥٠ پەندیك لە چاپ دراوە .

– جگەرخوێن ( گوتنا پێشنینا ) شام ١٩٥٧ .

– شێخ محەمەدی خاڵ ( پەندی پێشنیان ) چاپخانەی مەعاریف بەغدا ساڵی ١٩٥٧ کە بریتی‌یە لە (١٣١١) پەند ، وەلە ساڵی ١٩٧١ یشدا هەمان کتێبی بۆ جاری دووەم وەبە شێوەیەکی فراوان تر لەوەی پێشوو لە چاپی داوە ، ژمارەی پەندەکانی چاپی دووەم کەیشتووەتە ( ٣٨٩٣ ) پەند وەبە ئەلفوبێی عەرەبی ریزیانی کردووە وەلە پەراوێزا لە هەندێکیان دوواه .

– شاعیری مەزن خوالێ خۆشبوو حاجی تۆفیق (پیرەمێرد) کۆمەڵێك لە پەندی پێشینیانی لە شێوەی شیعر هۆنیوەتەوە وەختی خۆی لە چاپخانەی ( ژین ) لە چاپی داوە . لەوانەی کە بە شێوەی ووتار لە کۆڤارە کوردی‌یەکان دا لە پەندی پێشنیان دواوون .

– جەمال بابان ، گوڤاری (دەفتەری کوردەوازی) ژمارە دل ئەوانەی کە کتێبیان دەرباری ئەدەبی کوردی نووسیوە ولە کتێبەکانیانە باسی پەندی پێشنینیان کردووە :

– عەلادین سجادی ( مێژووی ئەدەبی کوردی) ١٩٧١ .

– عز الدین مصطفی رسول ( لێکۆڵینەوە لە فۆلکلۆری کوردی ) . لەو کوردانەی کە لە دەرەوی عێراق دەربارەی پەندی پێشنینیان نووسیوبانە لە ساڵی ١٩٥٧ لە یەریڤانی پایتەختی کۆماری ئەرمنستانی سۆڤیەت کتێبێك دەرچوو بەناو نیشان ( فۆلکلۆرا کورمانجا) کە حاجی جندی نووسیویەتی‌و ئامادەی کردووە .

وەك لە ووتارەکەمان دا روومان کردووە ئەم پەندانە بریتی بوون لە دەربڕی باری کۆمەڵایەت وسیاسی ، ئابوری وژیانی خێزانی نەتەوەی کوردمان ، هەر لەبەر ئەوەیش ئەبینین هەر کۆمەڵە پەندێك بۆ بارێك لەم بارانەی ژیان ووتراون وا ئێمەش لە خوارەوە بە پێی مەبەستی پەندەکاندا بەشی دەکەین :

**– پەندە ئایینی‌یەکان :**

– خوا کڵاوی بۆ بەرزو کردووە.

– خوا لە سولتان مەحموود گەورە ترە .

– کەسی بێ کەسان خوایە .

**– پەندە نیشتمانی‌یەکان**

– دار پوازی لە خۆی نەبێ نا قلیشێ .

– بەرد لە جێی خۆی سەنگینە .

– پشتم سەفین بێت پف لە ئاسنیش ئەکەم .

– ئەگەر زاڵ نەبی ، بەستەزمان نەبی .

– دوژمنی خۆی بە شکر ئەخنکێنێ .

**– پەندە ئابووری‌یەکان**

– کاسەی پیر ئاشتی ماڵە .

– هەتا هاتم‌بوو هەر هات هاتم بوو ، کە نەهاتم بوو ڕووی زوڵماتم بوو .

– قەرز کۆن ئەبێ ، نافەوتێ .

– ماڵی خۆ ئەخۆر بۆ چەکمە بۆر .

**– پەندە کۆمەڵایەتی‌یەکان**

– بەفیکە مار لە کون دێتەدەر .

– چەپلە بە دەستێ لێ نادرێ .

– گۆشتی بۆ تۆ ئێسقانی بۆ من .

– ژنیش هەیە وژانیش هەیە .

– هەر عەقلە لە خەسارێك .

**سەرچاوەکان**

– دەفتەری کوردەواری ، ژمارە (١) کانوونی دووەمی ١٩٧٠ .

– گۆڤاری کۆری زانیاری کورد بەرگی چوارەم ، ١٩٧٦ .

– عزەدەین مستەفا رەسوول \ لێکۆڵینەوە لە فۆلکلۆری کوردی .

– عەلادین سجادی مێژووی ئەدەبی کوردی . چاپی دووەم ، ١٩٧١ بەغدا .

– شێخ محەمەدی خاڵ\ پەندی پێشنینان . چاپخانەی کامەرانی ١٩٧١ چاپی دووەم .

– دەقەکانی ئەدەبی کوردی عەلادین سجادی . لە چاپکراوەکانی کۆری – زانیاری کورد ، ١٩٧٨ .

**قوتابخانە میللی یەکان چەند دەرفەتێکی نوێی شۆڕش بەسەرکردایەتی سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین بەدەست هێناون**

# خانەکانی بەغدا لە سەدەی نۆیەمەوە تاوەکو سەدەی بیستەم

**زانا**

**کردوویە بە کوردی**

**پێشەکی :**

شاری بەغدا ، شاری دێرینی عەرەب لە شارستانیەتو رۆشنبیریداو بە پیتوپێز لە هونەرو شوێنەواردا .. بەراستی گەورەترین شاری جیهان بوو لە سەدەکانی ناوەراستداو ئەو شوێنەوارە ماددیو بیریو هونەری‌یانەی کە پاراستونیو بە ئەمری هێشتونیەتەوە وایان لێ کردوە کە ـ لە سەردەمی عەباسی ـ دا لە شامو قاهیرەو قورتوبەو قوستەنتەنیە بەناوبانگتر بێ .

*

بەهۆی ئەو پێشکەوتنو بەرەسەندنەوە کە بەغدا ئەو کاتە بەخۆیەوە بینی بەتایبەتی لە مەیدانی ژیانی زانستیو کۆمەلایەتیو ئابوریو دروست کردنی قوتابخانەو زانکۆو کتێبخانەو مزگەوتو ڕوانگەی فەلەکیو دروستکردنی شارو کۆشکو خەستەخانەو روبارو ئاودێریو پردو خانو گەرماوو مەیدانی جریدبازیدا ... هند مەلبەندێکی شیاوی خۆی لە نێو شارەکانی دنیادا بەدەست هێناو ئەم شارە تاوەکو چارەکی یەکەمی سەدەی دەیەمی زایین ـ چوارەمی کۆچی ـ ئەم مەلبەندەی لە دەست نەداو لەوە بەو لاوە دووچاری دەستی دواکەوتنو کزیرەوەری بوو بەتایبەتی کاتێک ( عەجەمەکان ) لە فارسو تورك ، داگیریان کردو ئەو داگیرکردنەش بو بە هۆی کاول بوونو فەوتانو لەناوچوون سەرەڕای لافاوی یەك لەدوای یەكو بلاوبوونەوەی نەخۆشیو پەتاو قاتو قڕیو گرانیو ئەمانەش زوربەی دیاردەو شوێنەوارەکانی ئاوەدانیو رۆشنبیری شاری بەغدایان لەناو برد .

لەگەل ئەمەش‌دا بەغدا وەك شارێك بایەخو مەلبەندی خۆی لەنێو شارە ئیسلامی‌یەکاندا پاراستو وەك دووڕیانێك کە شارەکانی ناوچەکەی بە یەکەوە دەبەستەوەو کاروانی پێدا تێدەپەری بە گرنگی مایەوەو خزمەتی بازرگانو رێبوارو میوانەکانی دەکرد .

خانەکانی بەغدا ـ بەداخەوە ـ بە پێی پێویست لە لایەن شارەزار لێکۆلەرەوەکانەوە بایەخێکی وای پێ نەدراوە . هەروەها مێژوونووسەکان زۆرترینی لایەنە گرنگەکانی ئەم خانانەیان پشت گوێ خستوەو ئەو شتانەش کە لە سەریان نووسراوە ئەوانەیە کە لە کتێبی گەرێدەکاندا هەیەو کە ئەوە دەچێ ئەوانیش لەبەر هەندێ لایەنی سیاسیو ئابوریو کۆمەلایەتی‌یەوە ئەم شتانەیان تۆمار کردبێ‌و بایەخیان بە لایەنی ئەندازیاری نەداوەو لەم کتێبو سەرچاوانە « عێراق لە سەدەی حەفدەهەمدا کە تافرنێی نووسیویەتیو « گەشتی ابی طالب خان بە عێراقو ئەوروپادا سالی ١٢١٣ ی کۆچی ١٧٩٩ ی زایین »و « گەشتی نیبور بە عێراق لە سەدەی هەژدەهەمدا »و « گەشتەکەم بە عێراقدا سالی ١٨١٦ ی زایین »ی بەکنگهامو « گەشتی ریچ بە عێراقدا سالی ١٨٢٠ ی زایین »و « گەشتی ـ المنشیء البغدادی » کە سالی ١٨٢٢ ی زایین نووسیویەتیو « گەشتەکانم بە عێراقدا » کە برج نووسیویەتی[1] . ئەو زانیاری‌یانەی لەم کتێبانەدا هەیە کورتو سەرپێیو شێوەیەکی مێژوویان هەیەو پشت بە شی‌کردنەوەو قوول‌بوونەوە نابەستن[2] .

**وشەی خان :**

زوربەی سەرچاوەو مێژوونووسە کۆنو نوێکان لەو باوەڕە دان کە وشەی « خان » فارسی‌یەو کراوە بە عەرەبی[3]و لەوانەشە لە وشەی « خانە »[4] یاخود « حانە »[5] یان « خاناە »[6]وە هاتووەو کە هەموویان مانای خانوو[7] یاخود شوێن دەبەخشن سەرەرای واتای تر[8] .

هەندێ کەسیش دەڵێن وشەی خان لە وشەی خانوتی ئارامی‌یەوە هاتوە کە ئەویش لە وشەی (حنە)ی عیبرانی‌یەوە وەرگیراوە کە مانای خێوەتی هەلداو تێیدا دانیشت[10] دەگەیەنێ .

هەروەها وتراوە کە وشەی خانَ بەرامبەر بە وشەی « قیروان سەرای » تورکیو یاخود ( کاروان سەرای )یە کە
CaravanSary
or CaravanSeria
مانای خانو وتێلو تێدا دانیشتن دەگەیەنێ هەرچەندە جیاوازیی لە وشەکەدا هەبێو[11] وشەی « خان » مانای خانوو مالی رێبوارانیش دەگەیەنێ هەر وەك لە زمانی عەرەبیدا وا زانراوەو[12] . دەربارەی بنجو بناوانی وشەکە وتراوە وشەی خان کورت‌کردنەوەی وشەی ( قاغان )ەو کە لە عەرەبیدا بە ( خاقان ) ناسراوەو لەگەل نازناودا بەکاردەهێنرێ[13] .

بە گشتی دەربارەی بنجو بناوانی وشەکە لێکۆلەرەوەکان لە نێو خۆیاندا جیاوازنو هەندێکیان دەلێن فارسی[14] ـ تورکیە یاخود تەتەریە[15] یاخود بە تەنیا تورکیە[16]و هەندێکیش بە عەرەبی فارسی[17]دا دەنێنو دەتوانرێ بوترێ کە وشەی خان فارسیەو عەرەب بە بێ‌کەم‌کردنەوەو خستنە سەرو هەلگێرانەوە دەسکاری کردوە[18] .

## واتاکانی وشەی خان

هەر وەك رای جیاواز لەسەر بنەرەتو بنجی وشەی خان لە ئارادا هەیە ئەوا وشەکە چەند مانایەکی جیاوازی هەیە . وشەکە مانای ( حانوت )(19) دوکان دەگەیەنێو لەوانەیە ئەم مانایە لەوەوە هاتبێ کە هەردووکیان لە فراوانیو ئەرکدا[20] لەیەکتری دەچنو . وشەی خان مانای خاوەن دوکانیش دەگەیەنێو[21] هەروەها مانای شوێنی بازرگانەکانو دوکانی بازرگانیی دەگەیەنێو[22] بازرگانییەکەیان (٢٣) دەگەیەنێو مانای کاروان سەرای رێبوارو کاروانەکانیش[24] دەداتو وشەی وتێل بەرامبەر بە وشەی خانە[25] .. ئەوی شایانی باسە ( الجو الیقی کە سالی ١١٤٥ ی زایین کۆچی کردوە ) دەلێ : بە زمانی خەلکی شام وشەی وتێل مانای ئەو خانە دەگەیەنێ کە رێبوار تێیدا دەحەوێنەو شوێنەکەشی لە سەرە رێگا یاخود لە شارەکانەو برگەیەك لە « الفراء » وەردەگرێو دەلێ : « گوێم لە عەرەبێکی ـ قضاعە ـ بوو لەجیاتی ـ الفندق ـ واتە وتێل دەیگوت ـ فنتق ـ کە ئەمەش خانە »[26] هەروەها بەرامبەر بە وشەی «الوکالة»[27] و قەیسەریە (٢٨)و بازارو (٢٩) ئەوی شایانی باسە مێژوونووسەکانی سەدەکانی ناوەراست ئەم دامەزراوانەیان لە یەکتری جیا نەدەکردەوەو وایان دەبینی کە لە رەنگ بۆ رشتنیو ئەرکی سەرشانیاندا بەرامبەر بە رێبوارو بازرگانەکان(٣٠) وەك یەکنو لە یەکتری دەچن .
المقریزی لەسەر ئەم مەسەلەو بابەتە نووسیویەتیو گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێو ئەو دامەزراوانەدا نییەو[31] ئەوی شایانی باسە وشەی « الربع » مانای خان یاخود وتێل دەگەیەنێ[32] .

## مێژووی خان

لە ولاتی میسۆپۆتامیا زۆر خان دروست کراوە بەلام کەمێك لەو خانانە ماون کە گەیدەو مێژوونووسان باسیان کردوون ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك وەك :
ـ فەوتانو روخانیان بەهۆی ئەوەوە کە وەك جاران پیویستیی پێیان نەماوە .

ـ بەهۆی کارکردەی سروشتییەوە .

ـ گۆرانی رێگای کاروان بە لای ترداو دەرکەوتنی رێگای نوێی گواستنەوە .
ـ دروست‌کردنی شوێنی خۆشتر بۆ حەسانەوەی رێبواران وەك وتێل . لە لایەکی ترەوە لەناوچوونو فەوتانی خانەکان مەسەلەیەکی سروشتییە وەك ئەنجامێکی پەرەسەندنی شارستانی ماددی لە ژیاندا[33] .

لەبەر ئەوەی خانەکان بۆ رێبوارو گواستنەوە شتێکی پێویستنو بە بێ ئەم خانانە رێبوار نەیدەتوانی ماوەیەکی دوور رێگا ببرێ ئەوا ئەم خانانە وەك بازرگانی کۆنو بۆ ئامادەکردنی جێگای حەسانەوەو پشودان بۆ مرۆڤو ئاژەل دوای ئەوەی ماوەیەکی دووریان بریوە ، دروست کراون (٣٤) .
سەرەتای دروست‌کردنی خانەکان ئەوە بوو کە بیرێکی ئاوو شورەیەك بوو کە بە دەوری پارچە زەوییەکدا دەکێشراو وردە وردە پەرەی سەندو رەنگ رشتنی تێدا بەکارهێنراو دوا شێوەی وەرگرت[35] .

## بەرێوەبردنی خان

لە باری بەرێوەبردنەوە وا زانراوە کە ئەو کەسەی لەو خانانە میوان دەبێ تەنیا کرێ بەو کەسە ئەدات کە لێپرسراوی بەرێوەبردنی

خانەکەیەو کـــە بـــە ( ئەلگیم ) ناوددبرێ ئەم کرێیەش بەرامبـــەر بەو خزمەتەیە کە لێپرسراوی خانەکە پێشکەش بە رێبوارەکەی ئـــەکات هەر لـــە خواردنەوە تاوەکو ئالف بۆ ولاخەکەی و ئەم (ئەلگیم) ە چـــەند کەسێکی راگرتووە بۆ خزمـــەت کردن و لـــەو پارەیەی وەری دەگرێ دەیانداتێ(٣٦) .

### پەرەسەندنی خان

خان لە ناوچەی رۆژهەڵاتدا زۆر پێویست بووە ، بۆ ئاســـانکردنی هاموشۆو گواستنەوە لەنێـــوان شارەکانی ولاتانی ئیسلامدا بـــە مەبەستی بازرگانی و حـــەج کردن و سەردان لە جێنزرگەکان و ئـــەم خانانـــە وردە وردە پێشکەوتن و پەرەیان سەند تا وایان لێ هـــات بەرێوەبەرایەتی و چێشتخانەو(٣٧) مزگەت و عەمارو حـــەوزی(٣٨) ئاوو گەوریان تێدا کرایەوە جگـە لەوەی کە لە هەندێکیاندا مالی هـــەتیو(٣٩) دەپارێزرا ســـەرەڕای گەرماو(٤٠) بازاڕو دوکـــان و لــــە دەرەوەی خانەکە بۆ رێبواران و شـــوێنێك بۆ فرۆشتنی(٤١) شتومەکی پێویـست بە رێبوارو قاترو(٤٢) ولاخەکانی و . لە ئەنجامی بایەخی ئـــەم خانانەوە وای لێ هات کە شار هەبوو چـــەند خانێکی تێدا کرابۆوە(٤٣) .. لەبەر پتربوونی ئەرکی ئەم خانانەو فراوان بوونیان ئەوا پتر ژووریان تێـــــدا کرایەوەو لەم ژوورانەشدا ســـۆبەو ســـەکۆی خەوتن و دانیشتن دانران و ژووری تایبەتی لە لای دەروازەکە بۆ پاسەوان و چایخانەو عـــەماری وەستای چاککردنەوەی عـــەرەبانەو گالیسکەکان وەك دوکانی ئاسنگەری کرانەوە ســـەرەڕای گـــەوری ولاخ(٤٤) .

هەرچەندە خانەکان گـــەورەو فراوان بوو بوون بـــەڵام لە وەرزی تایبەتیدا پڕ دەبوون لـــە رێبوارو زۆر جار رێبوارەکان ناچار دەبوون کـە لـە شـــوێنی نزیك خانەکـــەوە بحـــەوێنەوەو(٤٥) وەك زانراوە هـــەندێك لـــەو خانانە جێگای ٣٠٠ – ٤٠٠ کەس و(٤٦) هـــەندێکی تریـــان جێگـــای ٥٠٠ – ١٠٠٠ کەسیان تێدا دەبۆوە(٤٧) .

لەبەر ئەوەی خانەکان چـــەند دامەزراوێکی هەبوو و پەرەسەندوو بوون و سروشتی تایبـــەتی خۆیان هەبوو کە لە بواری پەرەسەندنیاندا بەدەستیان هێنابوو بێگومان کاریان دەکردە سەر ئارەزووی خـــەڵك و خەلکەکەش ئەم جۆرە ئارەزووەیان لە جۆرو شێوەی ئەو بینـــایانەدا دەردەبڕی کـە دروستیان دەکردن وەك خانوو یان قوتابخـــانە یاخود مزگـــەت و شتی تر ئەمـــەش وا ددگەیەنێ کە کارتێککردنی بەرامبەر

لە نێوان دامەزراوە ئاوەدانییەکان و خانەکاندا(٤٨) هەیە گەریدە ناصـــر خسرو لـــە گەشتنامەکەیدا باس دەکات کە لە شاری تەرابلس لـــە لوبنان(٤٩) مالی وای دیوە کە لـــە خان چووەو چاوی بە هـــەندێ دامەزراوی ئاوەدانییانە کـــەوتوە وەك بازاڕو تەلاو(٥٠) کۆشك و(٥١) تەلارو(٥٢) دوکان و(٥٣) دێرو(٥٤) کلیسەو(٥٥) خانووبەرەی گەورەی تر .

### مێژووی دروستکرانی خانەکانی بەغدا

ســـەرچاوە مێژووییە کۆن و نوێیەکان شتێکی ئەوتۆمان نادەنـــە دەست دەربارەی ئەو خانانەی کـــە پێش ئیسلام لـــە شاری بەغـــدا هەبوون و دروست کراون . . بەڵام باس کراوە کە خانەکانی عیراق لـــە سەردەمی پاشا ( شولکی ) دروست کراون کە دووەم پاشای رەچەلەکی ئور بووە کە سالی (٢٠٩٤–٢٠٤٧) پیش زایین حوکمی کردوەو ئـــەم پاشـــایە بـــەتەنگ دروستکردنی رێگاوبان و خانووی گـــەورەوە بووە بۆ رێبواران(٥٦) .

دەربارەی خانەکانی بەغدا کە لـــە سەردەمی ئیسلامدا دروست کراون سەرچاوە کۆنەکان بە کـــەمی باسی دەکەن . یاقوت الحمـــوی دەلێ خانێـــك هـــەبووە « خـــان وردان »(٥٧) یان پێـــوتوەو لـــە رۆژهەڵاتی شاری بەغدا بووەو لـــە ســـەردەمی قۆناخی یەکـــەمی عەباسیدا(٥٨) دروست کـراوە . هەروەها لەو سەردەمەدا خان لـــە بەغـــدا هەبووو بازرگانە بێگانەکان تێیـــاندا حـــەوانەتەوە(٥٩) . الیعقوبی کـــە سالی ( ٨٩٧ ی زایین مردووە ) دەلێ خانێك لە بەغـــدا هەبووە ( خان النجائب )(٦٠) یان پێ وتوە .

لە کۆتایی سەردەمی عەباسیدا ( ١١٥٧ – ١٢٥٨ ی زایـــین) هـــەرچەندە شاری بەغدا دووچاری وێرەوەری بـــوو بـــەڵام زۆر دامەزراوی ئاوەدانی تێـــدا بووە ، ئەو سەرژمێرییەی کـــە یاسین العمری لە کتێبەکەیـــدا [ الدر المکنون في المآثر الماضیة من القرون] لـــە بارەی مزگـــەوت و قوتابخانەو خانەقاو خـــان و گەرماوەکانەوە کردویەتی کە لـــە شاری بەغـــدا هـــەبوون پێش ئەوەی مەغۆلەکان داگیری کەن باشترین بەلگەی ئـــەم قـــسەیەن و ناوبراو ژمارەی خانەکانی ئەوسای بەغدای بە ٩٨٠ خـــان داناوە(٦١) .

لـــە سەدەی حەوتەمی کۆچی سیانزە هـــەمی زایین ابن الفوطی

باسی خانێك دەكات كە لە بەغدا بووەو ( خان الخليفة )یان پێ وتووەو والی علاء الدين الجوينی فرمانی دروستكردنی داوەو لە نزیك ئاوی دیجلە دروستكراوەو وەستاكەشی كە دروستی كردوە ابو العباس احمد بن عبيد الله الاصفهانی بووە(٦٢) . ئەوی شایانی باسە ئەم خانانە ئێستاكە هیچ شوێنەوارێكیان نەماوە .

بەناوبانگترین خانەكانی بەغدا كە ئێستا هەر ماون (خان مرجان)ە كە سالی ١٣٥٨ ی زایین دروست ـ كراوە حاكمی بەغدا امين الدين مرجان لە سەردەمی سولتان اويس بن الشيخ حسن الايلخانی فرمانی دروستكردنی داوەو ( خان الاورتمە )ی پێ وتراوە . واتە ـ بە توركی ـ خانی سەرگیراو ، خان مرجان جوانترینی خانەكانی عیراقەو وەستایی‌و وردەكاریی‌و هونەركارییەكی زۆری تێدا بەكارهێنراوە . هەرچەندە ئەم خانە فراوان‌و بلند بووە بەڵام زۆر بە وەستایانە سەرەكەی گیراوە ئەمەش دەسترۆیشتوویی وەستاكانی دەردەخات .

ئەوی شایانی باسە ئەم خانە لەگەڵ دوكان‌و بازاڕو باخ‌و بێستاندا كراوە بە وەقف بۆ قوتابخانەی المرجانيەو خەستەخانە. ئەم خانە لە بازاڕی بەزازەكانە لە گەرەكی ( باب الاغا )ی ئێستا ئەم خانە لە دوو قات پێك هاتووە . قاتی یەكەمیان ٢٢ ژووروو قاتی دووەمیان ٢٣ ژووری تێدایە . ڕێبوارەكان لە ژوورەكاندا حەواونەتەوەو ماوەی حەوت سەدەش كڕین‌و فرۆشتن لە حەوشەكەیدا كراوە(٦٣) .

لە سەدەی دەیەمی كۆچی‌و شانزەهەمی زایین‌دا لە شاری بەغدا خانێك هەبووە ( خان جغسان )یان پێوتو ، و لە سەردەمی حوكمی سولتان مرادو لەسەر كیسەی جغالە زادە سنان پاشای والی بەغدا سالی ٩٩٩ ـ ١٠٠١ ی زایین دروستكراوەو لەوەوە ئەو ناوەی بە سەردا بڕاوەو ئەم خانە تاوەكو سالی ١٩٢٩ هەر مابوو ئەو كاتە تێكدراو شوێنەكەی كرا بە بازاڕو دەرگای هەبووە دەرگای لای ژووررو دوكان . وەك زانراوە ئەم خانە دوو دەرگای لای خواروو لەسەر دەرگاكانی بە توركی نووسراوەو لە ژێریشەوە چەند دێرێك بە عەرەبی . گەڕیدە نیبور كە سالی ١٧٦٦ ی زایین سەری لە بەغدا داوە ئەم خانەی دیوە(٦٥) .

لە سەدەی یانزەی كۆچی تاوەكو سەدەی چواردەی كۆچی بیستی زایینی كۆمەڵێكی زۆر خان لە بەغدا هەبووە كە ئێستاكە زۆر كەمیان ماوەتەوە . گەڕیدە تافرنێی دەڵێ دە خان لە بەغدا هەبووە بەڵام دووانیان نەبێ ئەوانی تر ڕێك‌و پێك نەبوون‌و بە باشی خزمەتی ڕێبوارانیان نەكردووە(٦٦) . گەڕیدە نیبور دەڵێ : لە سەدەی هەژدەی زایین‌دا بیست‌و دوو خان هەبووە چواریان لە دەوروبەری بەغداو ئەوانی تر لە نێو شاری بەغدادا بوون هەندێكیان گەورە بوون بازرگانەكان تێیدا دانیشتون‌و ئەوانی تر بچوك(٦٧) . گەڕیدە بەكنگبام كە سالی ١٨١٦ ی زایین سەری لە عیراق داوە شتێكی ئەوتۆی دەربارەی خانەكانی بەغدا نەوتوە كە ئەو كاتە ژمارەیان سێ خان بووە ، لەوەندە بەولاوە كە وتویەتی خانەكانی بەغدا لەو خانانە چوون كە لە دیاربەكر بوون‌و خانێك لە خانەكانی بەغدا خان مەرجان بووە(٦٨) . بەغدا خانی زۆر تێدا بووەو زوربەی ژوورەكانی ئەم خانانە شت‌ومەكیان(٦٩) تێدا نەبووەو گوایە ژمارەیان ئەوسا ١١٨ خان بووە بۆ وڵاخ تێدا ڕاگرتن‌و شت هەڵگرتن بوون‌و لە لایەن بازرگانەكانەوە(٧٠) بەكار ـ هێنراون‌و ئەو خانانە ئەمانە بوون :

١ ـ خان مەرجان : كە لەمەوبەر باسمان كرد .

٢ ـ خان لاوند : لە بازاڕی ـ فضل ـ بووە وەزیر داود پاشا والی بەغدا سالی ١٨١٦ ی زایین فرمانی دروستكردنی داوەو سەربازەكانی ( لەواند ) تێیدا نیشتەجێ بوون . ئەم سەربازانە پاسەوانی تایبەتی والی بوون . والی بەغدا نامق پاشا سالی ١٨٩٧ ی زایین حەوشەكەی كردوە بە باخ‌و حەوزێكی ئاوی تێدا دروست كردوەو دارو درەخت‌و دارخورمای تێدا چەقاندوەو شورەیەكی ئاسنی بە دەوردا كێشاوەو دوای لابرانی ئەم والییە پشتگوێ خراوە(٧١) .

٣ ـ خانی ( قابچيلر كهيەسی ) واتە خانی سەرۆكی دەروازە وانەكان‌و لە بازاڕی بەزازەكان بووە لەسەر ڕێگای جادەی ـ الصفافيرـ و كاتی خۆی اسماعيل ئاغای سەرۆكی دەروازەوانەكان فرمانی دروست ـ كردنی داوەو كردویەتی بە وەقف بۆ نەوەو میراتگرانی‌و ئەم خانە زۆر گەورە بووە(٧٢) .

٤ ـ خانی ـ دلة الكبير : لە بازاڕی بەزازەكان بووەو حاجی عبدالقادر دله ابن اسماعيل سالی ١٩٠٤ ی زایین دروستی كردووەو

دوو قات بووەو ئێستاکە شوێنێکی بازرگانی‌یە(٧٣) .

٥ ـ خانی ( دلة الصغیر ) لە مرادیەیە لە ناوچەی ( السکة خانە )(٧٤) .

٦ ـ خان جغان : لەمەوبەر باسمان کرد .

٧ ـ خانی ـ النخلە ـ یاخود خانی ـ مخزوم ـ لەسەر بازاری بەزازەکان بووە شیخ محمد المخزوم ابن احمد حافظ پاشا سالی ١١١٠ ی کۆچی دروستی‌کردووەو کردویە بە وەقف بۆ نەوەو میراتگرە ـ کانی(٧٥) .

٨ ـ خانی ـ الپاچەچی ـ لە نزیك مزگەوتی خەففافەکانەوەیە لە لای رۆژهەڵاتەوە ، حاجی ابو بکر پاچەچی دروستی‌کردووەو کردویە بە وەقف بۆ بەرژەوەندی‌یەکانی خەففافەکانو ئێستاکە شوێنێکی بازرگانی‌یەو دوو قاتە(٧٦) .

٩ ـ خانی ـ کبە الکبیر ـو (خان الپاشا )شی پێدەوترێ و کاتی خۆی موڵکی ئاڵ‌کبە بووەو وەزیر داود پاشا کڕیویەتی و کردویە بە وەقف بۆ مزگەوتو قوتابخانەکەی. خانەکە لە شەقامی ـ البنوك ـ ە (٧٧) .

١٠ ـ خانی ـ کبة الصغیر ـ لە شەقامی ـ بنوکە ـ ، خانی ـ الپاشا الصغیر ـ یشتی پێ دەوترێ . لەدوو قات پێك هاتووە وەزیر داود پاشا والی بەغدا کڕیویەتی و کردویەتی بە وەقف بۆ سودو قازانجی مزگەوت و قوتابخانەی ـ الحیدرخانە(٧٨).

١١ ـ خانی محمد سعید چلبی الشابندر : لەسەر جادەی ـ المستنصر ـە لە رۆژ ئاوای دادگای ـ الشرعیە ـ و لەدوو قات پێك هاتووە سالی ١٢٣٧ ی کۆچی دروست کراوە(٧٩) .

١٢ ـ خانی الدفتردار : لەسەر جادەی ـ المستنصر ـ بووە لە رۆژ ئاوای دادگای ـ الشرعیە ـو ئەم خانە تێك دراوەو خانووبەرەی تازە لە جێگاکەی دروست کراوە(٨٠) .

١٣ ـ خانی حاج یاسین چلبی الخضیری :ـ لە شەقامی المستنصرەو کاتی خۆی خانووی ـ حرمو ـدیوەخان بووە هی بەڕێز انور بگ درویش بك الحیدری و سالی ١٣٤١ ی کۆچی حاجی یاسین الخضیری ئاوەدانی کردۆتەوە و خانەکە دووقاتە(٨١) .

١٤ ـ خانی باب المعظم لەسەر شەقامی خەستەخانەی (الجمهوری) بووە گەورە بووە بازرگانێکی بەغدا بۆ ئیش‌و کاری بازرگانی بەکرێ‌ی گرتووە(٨٢) .

١٥ ـ خانی البرزنلی : لە کۆتایی شەقامی البنوك بووە ، حاجی صالح چلبی البرزنلی دروستی کردو . پێش بیست ساڵ ئەپارتمانێك لە جێگاکەی دروست‌کرا(٨٣) .

١٦ ـ خانی جنی مراد : لە بازاری وردە والە فرۆشەکان ( عطار )ەکانی ئێستاو بازاری مەرجانی جاران بووە . خانەکە دوو قاتە . قاتی خوارەوەی بیست ژوور وقاتی سەرەوەی بیستوسێ ژووری تێدا بووە . سالی ١٠٩٧ ی کۆچی حاجی مراد حاجی علي دروستی کردووەو کردویە بە وەقف بۆ میراتگرەکانی(٨٤) .

١٦ أ ـ خانی ـ الدجاج ـ لە خانە کۆنەکانی بەغدایە و لە بازاڕی عەتارەکان بووە .. لەجێگاکەیدا خانوو دوکانی نوێ دروست کراوە(٨٥) .

١٧ ـ خانی ـ المواصلة : سالی ١٩٠٧ بەشێك لەقوتابخانەی المستنصریە وەك خان بۆ بازرگانە ـ کانی موسڵ بەکار هێنراوە .

١٨ ـ خانی الزرور : لەو خانانەی بەغدایە کە ماوەتەوە و لە نزیك خان مەرجانە لە بازارە کۆنەکەی بەرگ دروان لەو کۆڵانەدا کە بەرامبەر بە دەروازەی سەرەکی خان مەرجانە . ئەم چەند وشەیە لەسەر دەرگاکەی نووسراوە : « السلطان ملك رقاب الأ(مم) السلطان سلیم بن السلطان سلیمان خان فخر آل عثمان عز نصر عبده امیر امراء ... » ئەوی شایانی باسە لەرۆژنامەی رەسمی ژمارە ( ١٧٢٧ )ولە ١٩٦٩/٥/٢١دا(٨٧) باسی ئەم خانە کراوە .

١٩ ـ خانی ـ القندرچیە ـ لەبازاڕی قوندەرەچی‌یەکان ( جوقچیە )کان بووە بەرامبەر بە مزگەوتی وەزیر(٨٨) .

٢٠ ـ خانی ـ الذهب الکبیر ـو خانی ـ الذهب الصغیر ـ : ئەم دوو خانە لەبازاڕی قەزازەکان بوون(٨٩) .

٢١ ـ خانی فتح الله عبود :ـ لەسەرەتای بازاڕی باب الآغا بووە لەشەقامی رەشید و لەژووروی مزگەوتی مەرجانەوە . ئەم خانە بە خانی ( اللکی )(٩٠) ناسراوە .

٢٢ ـ خانی گومرگ :ـ لەو شوێنە بووە کە گومرگ وبازاڕی زەڕنگەرەکان بەیەك گەیشتون و خانێکی بچکولە بوە و بەسەر قوتابخانەی المستنصریەوە بووە(٩١) .

٢٣ ــ خانی القبلانیه : لەبازاڕی القبلانیه بووە(٩٢) .

٢٤ ــ خانی ــ الوقف ــ بەرامبەر بە مزگەوتی مەرجان بوو(٩٣) .

٢٥ــ خانی دەروێش علي و خانی الریجی و خــانی المیمز ئەمانــە هەموویان لەسەرئەو جادەیە بوون لە بازاڕی ــ الصفافیر ــەوە جیــا دەبێتەوەو بــەرەو دینگە چی‌یەکان دەچێ(٩٤) .

٢٦ ــ خانی الرماح : لــەبازاڕی وردە فرۆشەکان(٩٥) بووە .

٢٧ ــ خانی العادلیة : لەتەنیشت مزگەوتی ( العادلیه الکبــیر ) بووە بەرامبەر بە دادگای شەرعی .

٢٨ ــ خــانی مزگەرەکــان ــ الصفافیر ــلــە دەروازەی بازاڕی مزگەرەکان بووە لــەبەری بازاڕی چۆخە چیەکانەوە(٩٧) .

٢٩ ــ خانی ــ المصبغه ــ لــە تەنیشــت خــانی خەفافەکانەوە بووە(٩٨) .

٣٠ ــ خانی لۆقنتە ( اللوقنطه ) لەبازاڕی مولە خانە بووە بەرامبــەر بە بازاڕی ــ القرطاسیه ــبووە .

٣١ ــ خانی ــالجسرــ : لــە کۆتایی بازاڕی القرطاسیه بووە .

٣٢ ــ خانی ــ الزنبــق : لەلای دینــگە چی‌یەکان بووە(١٠٠) .

٣٣ ــ خانی ــ التمر ــ لــەو جادەیە بووە کەبۆ ( شریعــة خان التمر )(١٠١) دەچێ .

٣٤ ــ خــانی کەبابچیــەکان ــ المضــماوی ــ لــە بازاڕی کەبابچیەکان(١٠٢) .

# سەرچاوەکان :


١ ــ المباح ، برهــان نزر محمد علي : عماره وتخطيط الخانات العراقيـــة : ص ٥ــ٦ ؛ رســالة ماجستير مطبوعة على آلة الطابعـة ومقدمة الى مجلس كليـة الآداب ــ جامعة بغداد ١٩٧٦م .

٢ ــ المباح . هەمان سەرچاوە . لاپەڕە ٦

٣ ــ العسكري ، ابو هــــلال الحسن بن عبدالله بن سهل بن سعيد بن مهران اللغــوي : التلخيص في معرفة اسماء الأشياء : حققـــه د. عـــزة حسن. ج١ ، ص ٢٩٦ ، مطبعة الترقي ، مطبوعات المجمــع العلمي بدمشق ١٩٦٩ م .

ــ ابن سيده ، علي بن اسماعيل: المحكم والمحيط الاعظم في اللغـــة ، تحقيق د. مراد كامــل ، ج ٦ ، ص ٣٩٠ ، ط١ ، مصر ١٩٧٢م .

ــ ياقوت الحموى ( شهاب الدين ابي عبــدالله ياقوت بن عبــدالله الحموى الرومى البغدادى ) : معجم البلـــدان : مجلد ٢ ، ص ٣٤١ ، بيروت . ١٩٥٦م .

ــ ابن منظور ( ابو الفضل جمال الدين بن مكرم بن منظــور الافريقي المصرى ) : لسان العرب . مجلـــد ١٣ ، ص ١٤٦ ، بيروت ١٩٥٦م .

ــ الزبيــدى ( محب الدين ابن الفيض محمـــد مرتضى الحسينى الواسطي الزبيدي الحنفي ) : تــاج العروس من جـــواهر القاموس : مجلد ٩ ، ص ١٩٤ ، ط١ ، مطبعــة الخيرية ، مصر ١٣٠٦هـ .

ــ بطرس البستاني : محيـــط المحيط . مجلد ١ ، ص٦٠٩ ، بيروت ١٨٧٠م .

ــ احمد رضـــا : معجم متن اللغة : مجلــد ٤ ، ص ٤٥٤ــ٤٥٥ ، بيروت ١٩٦٠م .

٤ ــ ادي شير : الالفاظ الفارسية المعـــربة ، ص ٥٨ ، المطبعـــة الكاثوليكية بيروت ١٩٠٨م .

٥ ــ اللبنانى ( طوبيــا العنيسى الحلبي ) : تفسير الالفاظ الدخيلـة في اللغة العربية مــع ذكر اصلها بحروفه . نشــره وصححه الشيخ يوسف توما البستانى ،ص٢٤ ،ط٢، مصر ١٩٣٢م .

٦ ــ ئەم وشەیە لەگەڵ وشــەی تردا بەکار هێنراوە وەك مــاڵ و خانوو نازناوی ــ سولتانی لەســەر ــ دەمی مەمالیك لە میــسر بۆ نموونە دەوترێ ( چەك و جبەخانە )و (مەی خانە )و شتی تر بڕوانە : احمـــد رضا : هەمان سەرچاوەی پێشــو ، مجلد ٢ ، ص ٣٦٣ ، بيروت ١٩٥٨م

٧ ــ ادى شــير ، سەرچاوەی پێشو ، ص ٥٨ .

ــ التبريزى ( محمــد حسين بن خلف ) : برهان قاطع . بتصحيح و اتمام محمـــد عباس ، ص ٤١٦ ، مهرمـــاه بكهزار وسيصد وسى وشش چــاپ پــيروز مؤســسه مطبوعات امير كبير .

ــ ايوار ( مادة خـــان ) دائرة المعارف الاسلامية ، ترجمة احمــد الشنتناوى وآخرون . مجلــد ٨ ، ص ٢١١ ( بدون مكـــان وســنة الطبع ) .

٨ ــ وشەی (خانە) هــــەروەك لەمەوبــەر وتمان مــانای خانوو دەگــەیەنێ جا بۆ خێزان یاخود بۆ ڕێبوارو بازرگان تێدا حەوانەوە بێ و لەمەوە وشەی (خان) وەرگیراوەو هایەکەشی لەیەکەمدا بۆ نیـــسبەت یاخود بۆ بچوك كردنەوەیە : ( د .

حسين محفوظ : حديث شخصي ١٩٧٠ .

٩ ـ له ولاتی فارس وشه‌ی (خانه) ئه‌و چوار گۆشه‌یه‌ش ده‌گرێته‌وه که له‌ته‌ختی شه‌تر ـ حدایه . ( ایوار . ماده خان ) ، دائرة المعارف الاسلامية . مجلد ٨ ص ٢١١ . ( بطرس البستاني : محيط المحيط ، مجلد ١ ، ص ٦٠٩).

١٠ ـ ادى شير : الالفاظ الفارسية المعربة . ص ٥٨ .
ـ اللبناني ، تفسير الالفاظ الدخيلة : ص ٢٨ .

ـ رشيد عطيه : معجم عطيه في العامي والدخيل . ص ٥٥ ، دار الطباعة والنشر العربية . سان باولو . برازيل ١٩٤٤ م .

11- Porter, R. K., Travels in Georgia, Persia, Armenia and Ancient Babylonia during the years, 1817-1820 vol.I. P. 209, London. 1822

هه‌روه‌ها بڕوانه : یاقوت الحموی : معجم البلدان ، مجلد ٢ ، ص ٦٧ .

هه‌روه‌ها بڕوانه : ناصر النقشبندي : خان مرجان . مجلة النفط ، ص ١٠ العدد ٦٧ السنة ١٩٥٦ م .

١٢ ـ رشيد عطيه : معجم عطية في العامي والدخيل ص ٥٥ .

١٣ ـ بارتلد ، ( مادة خان ) دائرة المعارف الاسلامية مجلد ٨ ، ص ٢٠٠ . وشه‌ی خان بۆیه‌کەم جار وه‌ك نازناو له‌سه‌ده‌ی ده‌یه‌می زایین له‌سه‌رده‌ی ئیسلام دا به‌کار هاتوه . له‌سه‌ر ئه‌و پاره‌یه نووسراوه که له‌خانیه‌کان لێیان داوه به‌لام جیاوازی له‌نێوان وشه‌ی قاغان و قائان که‌ماناى حاکمى به‌رز ده‌گه‌یه‌نێ و له‌نێوان وشه‌ی خان ته‌نیا له‌سه‌رده‌می مه‌غۆلدا ده‌رکه‌وتوه . ( بارتلد ـ هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشو ) . یه‌که‌م که‌س که نازناوی خانی لێنراوه ( جه‌نگیز خان ) بووه ئنجا یه‌که‌م پاشای عوسمانی‌یه‌کان سولتان ( عثمان خان ) سالی ١٢٩٩ ی زایین ئه‌م نازناوه‌ی پێدراوه و له‌سه‌رده‌می شه‌عه‌بباسی سه‌فه‌ویدا ئه‌م نازناوه له سه‌رۆکه‌کانی ده‌وڵه‌تی سه‌فه‌وی و سه‌رۆك خێڵه‌کانی ئێران نراوه . بڕوانه : احمد رضا : معجم متن اللغه . مجلد ٢ . ص ٣٦٣ .

١٤ ـ اللبناني : تفسير الالفاظ الدخيله ، ص ٢٣ .

١٥ ـ بطرس البستاني « مادة خان » دائرة المعارف مجلد ٧ . ص ٣٢٤ .

١٦ ـ يعقوب صروف و فارس نمر : باب المسائل ، « معنى خان » مجلة المقتطف ص ٩٤٧ ، ج ١٠ ، مجلد ٢٦ . السنة ١٩٠١م .

١٧ ـ رشيد عطية : سه‌رچاوه‌ی پێشو .

١٨ـ ابراهيم مصطفى وآخرون : المعجم الوسيط . ج١ ، ص ٢٦٢ مصر مطبعة القاهرة ، ١٩٦٠م .

١٩ـ ابن منظور : لسان العرب .

ـ الفيروز آبادى ( مجد الدين محمد بن يعقوب ) : القاموس المحيط ج ٤ ، ص ٢٢٠ ، مطبعة السعادة مجلد ١٣ ، ص ١٤٦ .

مصر ، ١٩١٣م .

ـ الشرتوني ( سعيد بن عبدالله الخورى ) : اقرب الموارد في فصح العربية والشوارد ج١ . ص ٣١٠ . مطبعة مرسلي اليسوعية بيروت ١٨٨٩ م .

٢٠ ـ ابن جبير ( ابو الحسن محمد بن احمد ) : رحلة بن جبير ، ص ٢٥٣ بيروت ١٩٦٤م .

٢١ ـ ابن منظور هه‌مان سه‌رچاوه .

٢٢ ـ ابراهيم مصطفى : هه‌مان سه‌رچاوه .

٢٣ ـ الجوهرى . ( ابو نصر اسماعيل بن حماد ) : الصحاح تاج اللغة وصحاح العربية . تحقيق احمد عبدالغفور عطار ، ج٥ ، ص ٢١١٠ . مطابع دار الكتاب العربي بمصر ، القاهرة ـ ١٩٥٦ .

٢٤ ـ التتوى ( عبد الرشيد ) : فرهنگ رشیدی ، ج١ . ص ٢٦٨ مطبعة كلكته ١٨٧٢م .

٢٥ ـ الزبيدى : تاج العروس . مجلد ٧ . ص ٥١ .

٢٦ ـ الجواليقى ( ابى منصور موهوب بن احمد بن محمد بن الخضر ) : المعرب من الكلام الاعجمي على حروف المعجم ، تحقيق وشرح ابى الاشبال احمد محمد شاكر ص ٢٣٩ . اعيد طبعه بالأفسيت ، طهران ١٩٦٦م .
وه‌ك زانراوه وشه‌ی ( فندق ) که‌ماناى ئوتێل ده‌به‌خشی فارسی‌یه. بڕوانه : ابن منظور : سه‌رچاوه‌ی پێشو . مجلد ١٠ : ل ٣١٣ .

٢٧ ـ بریتی بووه له وتێل و له‌چه‌ند شوقه‌و قاتێك پێك هاتووه ، قاتی خواره‌وه‌ی عه‌مارو گه‌نجینه بووه وقاتی سه‌ره‌وه‌شی بۆ خه‌وتن و حه‌سانه‌وه . . بڕوانه : توفيق احمد عبدالجواد : تاريخ العمارة والفنون الاسلامية . ج٣ .

ص ٢٠٣ المطبعة الفنية الحديثة ، مصر ١٩٧٢م .

٢٨ ـ توفيق احمد عبدالجواد : هەمان سەرچاوە . بەرگی ٣ ، ل ٢٠٥ .

٢٩ ـ قەیسەریی ، سەروگوپلاك شكاندنی ناوی قەیسەری قەرالی رۆم بووە . بروانە :

حسن ابراهيم حسن : تاريخ الاسلام السياسي والديني والثقافي والاجتماعي ج٤ ، ص ٤١٣ . ط ١ ، المطبعة المحمدية ، القاهرة ١٩٦٧م.

٣٠ ـ نعيم زكي فهمي : طرق التجارة الدولية ومحطاتها بين الشرق والغرب ( اواخر العصور الوسطى ) ص ٢٨٦ ، مطابع الهيئة المصرية العامة للكتاب ، القاهرة ـ ١٩٧٣م .

٣١ ـ المقريزي ( تقي الدين ابي العباس احمد بن علي ) : المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والآثار المعروف بالخطط المقريزية ، ج٢ ، ص ٩٣ـ٩٤ طبعة جديدة بالاوفست مكتبة المثنى ، بغداد ، بدون تاريخ .

٣٢ ـ له ولاتی میبر لەجیاتی ( الوكالة والخان والفندق ) وشەی ( الربع ) بەكار هینراوە . بروانە : توفيق احمد عبد الجواد : تاريخ العمارة والفنون الاسلامية ج٣ ، ص ٢٠٣ .

٣٣ ـ الباح : عمارة وتخطيط الخانات العراقية ، ص ٢٦ .

34- Pope, Arthur, upham, " Bridges fortifi cations & Caravanserais" Asurvey of Persian Art from Perhis - toric Times to the Present, (Editor) Pope, A. u. and (Assistant Editor) Acker- man, Phylis, Tex Archite - cture, vol, III P. 1245. London and New York, 1930.

35- Texier, C., Descrip - tion de l'Armenia LaPerse et La Mesopotamie, Paris 1842-52, 11 pp 110-111.

٣٦ ـ بدج ( سر ارنست الفردولس ) : رحلات الى العراق . ج١ ، ص ١٢٣ ترجمة فؤاد جميل . ط ١ ، مطابع دار الزمان . بغداد ١٩٦٦م .

37- Reitlinger, C. " Atow- er of skulls, " Ajourny through Persian and Turkish Armenia. P. 52 London, 1932.

٣٨ ـ ابن دقماق ( ابراهيم بن محمد بن ايدمر العلائي الشهير بابن دقماق ) : الانتصار لواسطة عقد الامصار ، ج٤ ، ص ٩٠ المطبعة الكبرى بولاق ١٨٩٣م .

٣٩ ـ المقريزي : الخطط ، ج٣ ، ص ٩٢ـ٩٣ .

40 - Teixeira. P. The travels of Peter Teixeira from India to Italy by Land, P. 27

٤١ ـ وازنراوە كە خانی رێبواران (Saffron) لە ولاتی فارس گەورەترین خان بووە (١٧٠٠) هەیوانی تێدابە سەرەرای چەند گەماوو بازار لەنێو شورەكانیدا ، بروانە :

Fraser, J., Narrative of Ajourney in to Khorasan, pp. 383-385, London, 1825.

٤٢ ـ ابن بطوطه ( ابو عبدالله محمد بن ابراهيم اللواتي ) : رحلة ابن بطوطة ، ص ٥٤ ، بيروت ١٩٦٤م .

٤٣ ـ ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مجلد ٤ ص ١١٤ .

44- Unsal, B. Turkish Islamic Architecture in Scljuk and ottoman Times 1071-1923 pp. 48 ff. London 1970.

٤٥ ـ تافرنييه (جان بابتسيت) : العراق في القرن السابع عشر كما رآه الرحالة الفرنسي تافرنييه ، ترجمة بشير فرنسيس وكوركيس عواد ، ص ٤٤ ، ٤٥ مطبعة المعارف بغداد ١٩٤٤ .

46- Teixeira, p., The Travels of Peter Teixeira from India to Italy by Land pp. 27 f.

47- Cowper, H. S., Through Turkish Arabia, P. 318, London, 1894.

٤٨ ـ الباح : عمارة وتخطيط الخانات العراقية ص ٣٠ .

٤٩ ـ ناصر خسرو ( ابو معين ) سفر نامة ، رحلة ناصر خسرو الى لبنان ومصر والجزيرة العربية في القرن الخامس الهجري . ترجمة د. يحيى الخشاب ، ص ٤٨ ، ط ٢، بيروت ١٩٧٠م .

٥٠ ـ المنشيء البغدادي ( محمد بن احمد الحسيني المعروف بالمنشيء البغدادي ) : رحلة المنشيء البغدادي ترجمه عن الفارسية : عباس العزاوي . ص ٤١ـ٤٢ ، طبع شركة التجارة والطباعة المحدودة بغداد ١٩٤٨م .

٥١ ـ كونل ، آرنست : الفن الاسلامي . ترجمة د. احمد موسى ص ١٥٦ بيروت ١٩٦٦م .

٥٢ ـ ابن جبير : رحلة ابن جبير ص ٢٢٣ .

٥٣ ـ ناصر خسرو : المصدر

سابق . ص ٤٠ ، ٤١ و٤٧ .

54- Teixeira, P., The Travels of P. T. from India to Italy by Land pp. 27 f.

55- Filmer, H., The Pageant of Persia, P. 217 London, 1937.

56- Pritchard, James. B., Ancient Neareastern Text Relating to old Testament. P. 585. U. S. A., 1969.

٥٧ ـ بەناوی وردان ابن سنانەوە كراوەتەوە كە سەركردەيەكی لەشكری عەبباسی ابو جعفر المنصور بووە .

٥٨ ـ ياقوت الحموی : معجم البلدان ، مجلد ٢ ، ص ٣٤١ .

٥٩ ـ المدور ( جميل نخله ) : حضارة الاسلام ، ص ٢٢ القاهرة ، ١٩٣٥م .

٦٠ ـ اليعقوبی ( احمد بن ابی يعقوب بن واضح ) : البلدان ص ١٠ . ط ٣ . المطبعة الحيدرية ، النجف ١٩٥٧م .

٦١ ـ بە دەسكاریيەوە لە د. مصطفى جوادو د. احمد سوسەوە وەرگيراوە . خارطة المفصل فی خطط بغداد قديما وحديثا . ص ١٩٤ مطبعة المجمع العلمي العراقي بغداد ١٩٥٨م .

٦٢ ـ مصطفى جواد واحمد سوسه ، نفس المصدر ، ص ٢٠٦ .

٦٣ ـ مديرية الآثار العامة : دليل متحف الآثار العربية في خان مرجان القسم الاول بغداد ١٩٣٨م .

٦٤ ـ نظمی زاده مرتضى افندی : گلشن خلفا ترجمة : موسى كاظم نورس . ص ٢٠٩ ـ ٢١٠ النجف ١٩٧١م .

٦٥ ـ نيبور : رحلة الى العراق في القرن الثامن عشر ، ترجمه عن الالمانية د. محمود حسين الامين مراجعة سالم الآلوسي ص ٣٢ بغداد ١٩٦٥م .

٦٦ ـ تافرنييه : العراق في القرن السابع عشر . ص ١٨ .

٦٧ ـ نيبور : هەمان سەرچاوە. ل ٤٤ .

٦٨ ـ بكنگهام ( جمس سلك ) : رحلتی الى العراق سنة ١٨١٦م . ج١ ، ص ١٩٧ ، ترجمة سليم طه التكريتي ، مطبعة اسعد . بغداد ١٩٦٨م .

٦٩ ـ الدروبی ، ابراهيم : البغداديون اخبارهم ومجالسهم ، ص ٣٩٤ ، مطبعة الرابطة ، بغداد ، ١٩٥٨م .

٧٠ ـ الشيخلي ( محمد رؤوف طه ) : مراحل الحياة في الفترة المظلمة وما بعدها ج١ ، ص ٦٣ ، مطبعة البصرة ، البصرة ـ ١٩٧٢ .

٧١ـ الدروبی : هەمان سەرچاوەی پێشو . ل ٣٩٤ـ٣٩٥.

(٧٢ـ٧٣) البغداديون ، ص ٣٩٥

٧٤ ـ الشيخلي ـ هەمان سەرچاوە .

( ٧٥ـ٧٦ـ٧٧ـ٧٨ـ٧٩ـ٨٠ ) الدروبی : هەمان سەرچاوە .

٨١ ـ الدروبی : البغداديون . ص ٣٩٦ .

( ٨٢ـ٨٣ـ٨٤ـ٨٥ ) هەمان سەرچاوە . ل ٣٩٧ .

٨٦ ـ الشيخلی : مراحل الحياة في الفترة المظلمة وما بعدها ج ١ ص ٥٦ .

٨٧ ـ تقرير ممثل مديرية الآثار العامة في خان الزرور ، رقم الاضبارة : ٥٤٥/٤٠ .

٨٨ ـ الشيخلی : مراحل الحياة في الفترة المظلمة وما بعدها ، ج١ . ص ٦٣ .

٨٩ ـ الشيخلی : هەمان سەرچاوە ، ج ١ ، ل ٦٤ .

٩٠ ـ سركيس ( يعقوب ) : مباحث عراقية في الجغرافية والتاريخ والآثار وخطط بغداد .. الخ القسم الثاني. ص ١٣٥و٢٨٤ـ٢٨٥ تقديم رفائيل بطي ومير بصري ، شركة التجارة والطباعة المحدودة ، بغداد ١٩٥٥ .

٩١ ـ سركيس ، هەمان سەرچاوە ، ق ٢ ، ل ١٨٧ـ١٨٨ .

( ٩٢ـ٩٣ـ٩٤ـ٩٥ـ٩٦ ) : الشيخلي : هەمان سەرچاوە . ج١، ل ٦٥ .

( ٩٧ ـ ٩٨ـ٩٩ـ١٠٠ـ ١٠١ ـ ١٠٢ ) الشيخلی : هەمان سەرچاوە .

# فەقیێ تەیران و فنك

عبدالرقیب یوسف

فنك (FINIK) دکەڤی سەر کەناریێ ڕوژهلاتا یارویباری بوتان ( دجلەو ) دباکورا بازاریێ جزیرێدا بنێزیکا (٢٠کم) ودژێر زنجیرا چیای سپیدا یاکو دگەهی زنجیرا چیایێ (جودی) . فنك باغەکی گەلەك هەیەو ڕوبارەك ژ وی گەلیێ پشتا وی ژێ دزێ .

نهو فنك گوندەکی بچوکە نێزیکی بیست مالانەو خەلکی وی دشکەفتاندا دژین دەوری (٢٠٠-٣٠٠) شکەفتەك لێ هەیە بەلێ فنك بازاڕەکی کەڤنێ کوردستانێ بویە ناڤی وی دهندەك کتیبێن (ئغریق)یاندا هاتوە سترابو ( ٦٦ پیشزایینی - ٢٦ زایینی ) دا ب ناڤی ( پیناکا ) ویان (پنیاکا ) ڤەهینایە وگوتیە بازاڕەك یێ ( کوردونین ) ە .

دیارە دەولەتا (فرثی) ان (٨٤ پیش زا - ٢٢٦ زا ) فنك بجهەکی گرنگ زانییە هەر وەکو ئاشوریان ( شاخ )لنك (جودی) بجهەکی گرنگ ژمارتیە چونکە فرثیان شندەك ئاسارێن خویان بجیهێلانە وەکو گوڕێن کەڤری و سی هەلکەندراو ( منحوتات ) یەك ژوان هەلکەندراوا « بوكو زاڤا » یە یێ کو دکەڤی دوی کاشی بەرامبەری گریێ کەلهیێو گوندیێ فنکدا ژ ئالیێ روژهلاتڤە درێژاهیا زەلامی ١٧٥ سم وپاژنێ ١٦٥ سم .

کەلها فنك یا بناڤو بانگ دکەڤی سەر گرەکی ئاسیێ یا کو ژ هندەك ئاڤاییو دەوری سەد شکەفتان وهندەك چالێن ئاڤێ پێكهاتیە چیایێ شنکالی(سنجار) وەکو مزی ژیڤە دیارە فنك بلژاڕەکی شورەهـ کرایی بویەو نهو گەلەك ژ شورها وێ تیبەدبێن بەلی دیارە گەلەك ژمێژڤە هەرفیەو دورنیە ئەو شورهە دچاخی فرثیاندا هەبی دەوری (٥٠٠)سالان یان پتر فنك جهێ میری یا بەژنووی بویە یا کو د کتیبێن عەرەبیدا بناڤی « بشنوی » هاتیە پاشی بنەمالا ئازیزان ( لی جزیری ) بەژنووی دنیڤ برنەو چوقلەك یاخویان لی فنکی جیهـ نشین کرن بەحسا شوینوار ومیژووا فنك بهورو درێژ هاتیە نڤیسێن دکتیبا ( گەشتەکی ئەرکولوجی دکوردستانا باکوریدا ( ١٨٢ - ٢٤٦ ) کتیبەکی دەستنیڤیسە نهو ژ ( ٦٤٤ ) روپەر پیکتێ بەحسا نەقیێ تەیران لەگەل فنکێ تیبە کرنو ژ ئاخافتنین خەلکی وێ ودەورو بەرێن وێ بەلکو ژ ئاخافتنێن زانایێن ئایینی لبوتان ژی تیبە زانین کو تەیران هندەك ژیانا خو لفنکێ بریە سەر .

زاناو شاعری کورد سەید عەلییێ فندکی یێ کو شەهرەزاي یەکی گەلەك هەبوە دگوت : فەقی (مەلحەما) خانی دم دم لفنکێ دانییەو دروست کریە .

مەد دکتێبا خودا ( دیوانا کرمانجی ١٢٢-١٣٦) دا باشترین سەرهاتیا ژیانا تەیران هەتا ئەو چاخە نڤیسیبوو هندەك خالێن نوێ دژیانا ویدا مە ئێخستە بەرچاڤ یەك ژوان ئە وە بو کو مە گوتی فەقی هندەك ژیانا خو دفنکێدا بوراندیە بەلێ نهو ئەم بسەر هندەك تشتین تر بناڤێ وی لوێرێ هەلبون وئەڤژی پێشکیریا وێ ئاخافتنا مە گوتی دکە چونکە مە ل وی چاخی ئەڤە نەدزانی .

### ١ - « مەدرەسا فەقهێ طەیرا »

نهو بڤی ناڤیڤە مەدرەسەیەك هەیە ودکەڤی دژێر گریێ کەلهێ وراسەری دجلە ل نك کوژیێ روژئاڤایێ شورهێ. لنك رەخێ وێیێ راستێ نهالەکی بچوك هەیە ئاڤەکی بوش ژێ دزێ دنیڤبەینا کەلهێو گوندیێ (کەرەشا)دا . مزیەفتو خانەکی کەڤن دکەڤن باکوری مەدرەسێ نێزیکی سەرکەهنییێو چەند شکەفتەك ژی دکەڤن پشتا وێ .

ئاڤاهیا « مەدرەسا فەقهێ طەیرا » ژ روژهلات بەرەو روژئاڤا دچی درێژاهیا وی ( ٤٧ م ) و( ٦٠سم ) وپەحناهیا وی ( ٢٤ م ) وستوریا دیواری ژ ئالیی باشورڤە ( ٥ر١ م ) دەرگەیەکی بچوك دکەڤی ئالیی باشور نێزیك کوژیێ شورهێ پەحناهیا وی یانی فرەهیا

وی ( ٩٠ سم ) وا دیاره ئەڤە نە دەرگەهێ وێ یێ مەزنە .

دکوژیێ باکوری مەدرەسێدا گومبەتەك یان ئودەیەك بانێ وێ دیارە وەکو قوببەك بویە هەیەو جێکای چەند ئودەیەکێتر ژی دیارە وهندەك پەنجەرە ژی بئالیێ باشورڤە دیارن .

مەدرەسە ژ کەڤرێن رەش‌و هندەك سپی هاتیە ئاڤاکرن .

دیارە نەخش هاتیە ب کارهینان‌د ڤی مەدرەسی دا چونکە کەڤرەکی دریژو ومەزن تیدا هەیە وهندەك نەخش ل سەر هەنە وئەو ژی کەڤرێ سەر دەرگەهێ وی یێ مەزنە یان دەرگەهێ حوجرەیەکێ‌یە . ل نك وێ ئودا مە گوتی گورەك هەیە هندەك نڤیسینا عەرەبی ونەخش ل سەر هەیە وهەروها رسمێ خەنجەران ل سەر چەند گورەکێتر دحەو شا مەدرەسێدال بەرسنکا وێ ئودێ هەیە نە دورە ئەڤێن هە گورێن هندەك ژ میرێن فنکێ بن چ ژ میرێن بەژنو یان ژ بنە مالا ( مهران ) یان ژ بنە مالا ئازیزان .

دیوارێ سنکێ مەدرەسێ گەلەك ژی مایە بەلێ دیوارێ پشتێ گەلەك ژێ هەرفتیە .

خەلکێ فنك‌و کەرەشا ودەوروبەرین وان بو وی دبیژن « مەدرەسا فەقهێ طەیرا » ودبیژن فەقە دڤی مەدرەسێ دا مایە وئەڤە وێنێ وێ مەدرەسێ‌یە .

**١ ـ وێنەیا مەدرەسێ**
**٢ ـ وێنەیا کەلها فنك**

ئەڤ مەدرەسە وەکو دیارە گەلەك کەڤن ترەژ چاخی تەیران .

**٢ ـ خلوەتا فەقهێ طەیرا**

بڤێ ناڤێ ئە د نیڤ دەحلا فنك دا کەڤرەك هەیەو خلوەتەکی بچوك تیدا هاتیە کولان ونهو ئەو کەڤرە دنیڤ (بێرما فتاح بەگ) دایەو خەلکێ فنك دبیژن ڤان سالێن پیشیێ لەهیێ لیدا وکەڤر وەرگەراند ودەڤێ خلوەتێ کەلیە ئەرزێ .

نە دورە تەیران د ڤێ دا ( عبادەت ) کربی ڤێجا بناڤێ وی ڤە مابی هەر وەکو مەدرەسێ‌و هەروەکو « خلوەتا شێخ مەم‌و » شیخ مەم‌و شەش سەد سالان دپێش فەقیێ تەیران بویە ابن الأثیر د ( اللباب في الانساب ب ١ ر ١٢٧ ) بەحسا « البشنوی » دا ناڤێ « شیخ ممك » هینا یە وگوتیە هندەکی دپێش سالا ( ٤٠٠ ك = ١٠٠٩ زا ) دا مریە وهەروەسا گوتیە شێخەکێ صوفی وقەنج بویە .

ئەم دبینین خەلکێ فنك هەتا نهو ناڤێ وی ژبیر نەکرنە هەروەسا گورستانا گوندی ژی ب ناڤێ « زیارەتا شیخ مەم‌و » ڤەیە وهەروها ئەو کاڤل یان ئودا هەرفیی یاکو گورا وی تێدا یەو دار تیدا هشین بونە بو وێ دبیژن « کاڤلێ شیخ مەم‌و » ئەو گورستانە د کەڤی تەنشتا گوندی ب ئالێ باکوری روژ هلاتڤە و ل سەر کەنارێ روبارێ فنك .

خلوەتا شیخ مەم‌و شکەفتەکی بچوك‌و نەپەندی بەمحرابەك تیدا یە دەڤێ وێ بچەکی بلندە دکەڤی پشت کاڤلێ‌وی ددەڤی روباری دا ژبەروی کو خلوەتا وی نك خەلکێ دا پیروزە کوچەر چاخێ هاڤینان د چن بو زوزانان هندەك تشتێن خوێێن زێدە تێخنە تێدا وکەس نادزێ .

ڤێجا ئەگەر ئەڤ تشتێن هە ب ناڤێ شیخ مەم‌و ڤە مانە ژ دەوری هەزار سالان هەتا نهو وخەلکی ژ بیر نە کرنە جا ماینا وێ مەدرەسێ وخلوەتێ ب ناڤێ نەقیێ تەیران ڤە وپەیوەندی ( عەلاقە ) د نیڤ بەینا وان دا جێکای باوەرکرنە چونکە چاخێ وی گەلەك نێزیکتر بویە وئەوژی وەکو شێخ مەم‌و خودان ناس و تاعەت گەرەکی مەزن بویە ل نك خەلکی وژبەر ڤێ یەکێ ناڤێ وی ب فنك‌و وان جێکاکان ڤە مایە وژبیرا خەلکی نەچوە .

ئەم دشێن بێژین ئەڤێن هە نیشانا وی نە کو گەلەك‌ژناڤێن گوندان وجهێن بناڤی مروڤێن ناڤداریان نەناڤدار ڤە هەنە ل کوردستانێ دا وەکو ناڤێ زیارەتان وکەلهان وگورێن مروڤێن ئایینی ... کەڤن و رەهێ خوێ میژوی ڤە هەنە ئوپێتڤی‌یە ئەم وان ب پارێزین چونکە ژ سامانی نەتەوەی کورد تێنە هژمارتن بەلێ رەهێن خوێ میژویی هەنە ئەگەر چەند میرویا وان نە هاتیە نڤیسین وئەگەر ابن الأثیری جزیری ناڤێ شیخ مەم‌و یێ بەژنووی ( بشنوی ) نە هینابیا مە تشتەك ژمێژویا وی وئەو تشتێن کو بناڤێ وی‌ڤە هەیە نە دزانی ومە بهایەکێ میژویی نە ددایێ .

ئەگەر بێژم دارەك مەزن یا ( طاوك ) یێد نیڤ بەینا

مەدرەسا فەقیێ تەیران و دجلە دا ل سەر رێیا گشیی یا پەیادان ( رییا ئوتومبێلان نا گەهێ فنك ) ـ ب ناڤێ فەقیێ تەیران ڤەهەیە ودبێژن دژێر وێدا مەشــقو نفسین کریە ـ نە دورە هندەك ژ خوندەواران ئەڤا هــە ب تشتەکێ کەمو بێ سود بزانی وباوەر نەکە یان بدور بزانی نەخاســـما ئەگەر نرخی مێژو وتشتێ مێژویی نەزانی بەلێ ئەڤا هە نە دورە ئەگـــەر ب زانین دارێ گوێزەکێ ل کوردستانی دا هــەیە وتەمەنی وێ دەوری هەزارو سێ سەد ( ۱۳۰۰ ) سالە ئەڤ دارگوێزە ل نك گوندێ ( دڤرێ ـ دورا ) یە یاکو دکەڤی ناڤچی ( نهلە ) ژ قەزا ( ئاکرێ ـ عقــرە ) ئەو دارە ژی د سالا ( ۸۷۰ ) زایینی دا ( توما المرجی ) بەحسا وێ کریە وگوتیــــە ( ماریو حنان الدیلمی ) ئەو دار گوێزە چــاندیە وهیچ گوێزەکی تر وەکو بەرێ وێ نادە وگەلەك جاران خەلکی ( شتل ) ژی چاندنە بەلێ هشین نە بویە .

ئەڤ گوێزە نهو ژی مایە ب ناڤێ ماریو حنــان ڤە ل ( دڤرێ ) هەر وەکو زانایێ بەرکــەتی ( بیر ابونا ) دبێژی د ( تەعلیقا ) خودا ل سەر ڤێ ئاخافتنــا توما تەماشە ڤی کتیبا توما بکە ( كتاب الرؤساء ر ۹۲ـ۹۳ ) یاکو بیر ابونا ژ سوریانی وەرگەڕاندی بو عــەرەبی ول موصل هاتی چاپکرن سالا ۱۹٦٦ .

ئەوا بابەتا گوتنە ماریو حنان ژ دایك بویە دچاخێ بەتریێرکیا گورکیسێ ئێکێ یێ خەلکی هــەریما کوفری بێ ژ سالا ( ٦٦۱ ؟ ـ ٦۸۰ ) زایینی دا .

دیــسان ئاخافتن هەیە کو فەقێ تەیران هەلبەستا خو «ئەی ئاف وئاف» ل سەر کەناری ئاڤا بوتان (دجلە) ل فنکێ ڤەهوناندیە مە ب درێژاهی بەحسا ڤێ یــەکی کریە ل لێکولینا خودا دەربارا ڤێ هەلبــەستێ ودڤان نێزیکان دا بلاڤ دبی .

هەروها وەکو بلاڤە نەقێ ل فنکێ هەلبەستەك یا خو ڤەهوناندیە وتێدا ئاڤێتیە ژەنەکێ ژ خەلکێ گوندێ ( خەندەکێ ) یاکو دکەڤێ بەرامبەری فنكو راســەری دجلە خەندەك ژی کەلهەك بویە ونهو ئاساری خانیــان وسور وخەندەکا وێ دیارە پێشیا وی هــــەلبەستی ئەڤەیە ·

نەرێ شوخێ نەرێ شەنگێ
دەرێ سورێ ل ناف تەنگی

تەماشە ( دیوانا کرمانجی ر ۱۲۵ ـ ۱۲٦ ) بکە ب درێژ تر بەحسێ ڤێ یەکێ تێدا هەیە هەروها تەماشــە رویەرێ ( ۱۲۳ ) بکە .

ژ ڤان هەمی ئاخافتینی مەگوتی وژوان جیکایێن کو هــــەتا نهو ب ناڤێ ڤە ل فنکێ هەنە تێیــە زانین کو فەقێ ل فنکێ مایە وهندەك ژیانا خو تێدا بریە سەر بەلێ دچ مێژویەکــدا وێدێ بویە ؟ یا نێزیك ل نك من ئەوە کو د سالا ( ۱۰۳۱ ك = ۱٦۲۱ / ۱٦۲۲ ) زایینی دا ل فنکی بویە وچویە بو ( جزیرێ ) ول وێدێ ئــەوی ومەلایێ جزیرێ هەلبەستەك پێکڤــە ڤەهوناندنە یاکو ئەڤ مێژویا مەگوتی تێدا یە ژ بەکەم مالکا فەقێ تێیــە زانین کو ل جزیرێ بونە چونکە ناڤێ وی تیداو هاتیە :

سەلاما من حەڤیری صەدەفەك دڤێ کو تێ کن
ئیرو د ( جزیرێ ) حققە کو ل ( مەلێ ) کن

هەر وەسا مەلا ژی ناڤێ جزیرێ دمالکا دیماهیکا ڤێ هەلبەستێدا هینایە تەخلیتا هوناندنا ڤێ هەلبەستا گرنگ وبەرکەتی رێکا وی نادە کو بێژین هــەردو ل نك یەك نە بونە د چاخێ ڤەهوناندنێ دا تا بێژین هەریەکیان کەرتك ( مقطع ) ێن خو ڤەهوناندیە وبو ئەوی تر ناردیە یان بێژین فەقێ ل فنکێ ڤەهوناندیە یان ل جهــەکی تر و بو ( مەلا ) ناردیە و پاشی وی ژی یا خــو ڤەهوناندیە و بو وی ناردیە و هەر کەرتەك یا خـــــو دژێریا وێدا ڤەهوناندیە چونکە هندەك وشین بەهرا بتر ژ کەرتێکن هەریەك ژ هەردوان کەتیە د مالکا پێشیێ ژ کەرتا ئەوێ تر و ب ڤێ تەخلیتی ڤەهوناندنە تا کەرتێکن هەردوان وەکو ڤولفێکی زنجیری لی هاتیە و ب هەڤو دیڤا هاتنە گریدان تەماشە هەلبەستا مەلا و فەقێ بــەلکو باشتر ئەوە کو بێژین یا ( فەقیو مەلا ) بکە د ( دیوانا کرمانجی ر ۲۹ ـ ٤۲ ) یا کو ژ ( ٥۰ ) کەرتك پێك هاتیە . ئەگەر یەك بپرسی وبێژی ئەگەر فەقی د سالا ( ۱۰۳۱ ك ) دا ل جزیرێ بی یان بێژین فنك بییەو بوسەرەدان چویە جزیرێ ئاباد سالا بەراهیا وی دا چیروکا « شــێخێ صنعانیا» ژی ل وێدێ ڤەهوناندیە یانلێ جێگایەکی تردا ئەمێ د لێکولینەکێ تردا باسی ڤێ یەکێ ب کێن .

* عبدالله سەراج *

## خوێندنەوەیەکی نەوباوی

# شیرین و فەرهاد

وابزانم گشـــتمان لـــەوەدا یەکدەگرین کە داستان‌و ئەفسانەی میتافیزیکی‌و فۆلکلۆری‌ي هـــەر نەتەوەیەك ، چاوگ‌و گەنجینەیەکی بێ‌مانەندو لە دوا نەهـــاتووە بـــۆ وەچەکانی دوا ڕۆژی . جا ئیلهـــام وەرگرتن لەو کـــەلەپورانە ، بـــە گوێرەی گیانی ســـەدەو بۆچوونی نووســـەرو کردنیان بە هێمـــاو جەفەنگ بۆ ڕوونکردنەوەی کێشـەو نەبەردی چاخ‌و ( توظیف ) کردنیان بۆ دیاری کـــردني ئایندەی مرۆڤي سەردەم : کارێکی ئیجگـــار پیرۆزو دڵ خۆشکەریشە . ووتم ( ئیلهام )، نەك گێڕانەوەی ڕووداوێك یان بـــە شان‌و بازووي قارەمانێك هەڵدان . واتە تێڕوانینێکی تایبەت لە عاست ئـــەو ڕووداوانەو قارەمـــانانە بۆ چەسپاندني جۆرە فەلسەفەیەك کە نوسەردەیەوێ ، لە زەمینـــەی ئەو گێڕانەوەیەدا دەری ببڕێت . هـــەر وەك چۆن ســـارتەرو کامۆو جـــان ئانوی‌و ... هتـــد لەم کـــارەدا دەستێکی باڵایان هەبووە ؛ هەر لەم ڕوانگەیەوە . ئاوڕێك لە (ئۆدیب) ي سفۆکلیس دەدەمەوەو دیکەم بـــە شا بەڵگەی نیازەکەم .

هەتاکو ئێستا پتر لە ( ٣٠ ) سی نووســـەر ئـــەو شاکارەیان تاوتۆ کردووەو ڕۆشنایی‌و سۆمای جۆراو جۆریان ئاراستە کردووە . جـــان کۆکتۆ دوایین ئەو شانۆ نووسانەیـــە کە دەستی لـــەو تراجیدیایە وەرداو لـــە هێلـــە درامایەکەی دەری چوواندو بیرو باوەڕی خۆی لـــە بارەی زۆر گرفت‌و نەبەردی‌جیهاني‌و هـــەلودستي مرۆڤایـــەتی‌ي تێ ئاخنیوە . ئەگینا تەنیا تۆمار کردني کەلەپوورو لـــە چاپ دانـــەوەی ڕووداوێکی مێژوویین شتێکی ئەوتۆ ناگەیێنێ . ئـــەوەتا . ســەرانـــەری میسیولۆجیای ( گریك ) پڕە لـــە تراجیدیای سەرسوڕێنەر ، کـــەچی ناوي : **ئەسخیلۆس‌و یوربیـــدس‌و سۆفۆکلیس** ، لەو بوارەدا مـــایەی شانازیی هەموو ئەدەبی جیهـــانە چونکە ، دلێرو نیمچـــە خواکانیان وەك زیندەوەرێکی ڕاســـتی خۆیان سەیاندۆتە ناو مێژووی زوربـــەی گەلانەوە . جا ئەگەر شـــیاو بێ ، منیش داستانی ( شیرین‌و فەرهاد ) دەخەمە پاڵ ئەو شاکارانەو لـــە گۆشەیەکەوە ، چـــەپکێ تیشکی تێدەگرم ؛ چونکە ئەو ئەوینە پاکەو ئەو بەربەرەکانیە سامناکە لە چەند شاکارێکی ڕۆژهەڵات‌و بە تایبەت لـــە ئەدەبی فارسی‌و تورکی‌و کوردیدا ، ڕەنگی داوەتەوەو نموونەیەکی هەرە مەزني بە خۆیەوە گرتووە . ئەمە بە تایبەت کە کاکە حەمەی مەلا کەریم ئەرکی یەکالا کردن‌و لە چاپدانەوەی ( خوسرەو شـــیرینەکە )ي خاناي قوبادي‌ي گرتە ئەستۆ ، ئەم کارەی ناوبراو گیانی توێژینەرەی لـــە لام وروژاند لەوەی کە [ شـــیرین‌و فەرهاد لـــە هەموویان دلگیرترو جێگیرترو خۆماڵی‌ترو چەسپاوترە؟ ] بەیانی ژمارە ( ٥ )ی سالی ١٩٧١ . بۆیە ماوەیـــەك عـــەودالی کتێبی مێژوویی بووم بۆ ئەوەی شتێك لەو نەخشانەی بێستوون‌و تاق وەسان‌و دوکانی داوودی نزیك قـــەسری شیرین‌و سەرپیلی زەهاو هەلکڕێنم‌و کەوتمە متۆی سێنیني ئەو وێنـــەو تابلۆیانەی کـــە لەمەڕ نـــەخش‌و تاشراوەکانی فەرهاد گێڕاوون . بـــە کامي دڵ گەیشتم ، لـــە ئێوارەیەکی تەمووزی سالی ١٩٦٨ بـــە جاوی

سۆزناك و سەرنجی وردەوە ، لە ماست ئەو هەلکەندراوانەدا ، كرنووشم برد ، ئەو ئان و ساتە ، لە من وابوو کاتژمێرەکەم لە چرکە کەوتووەو تەنانەت ڕەوڕەوەی مێژوو ڕووەو دواوە دەمبات ، لەوەی ڕاستي بێ وامزاني ( تاق وەسان ) کەوانەی سەرکەوتنەو لە سایەیدا هەستم بە مەزنی و بالایی هونەری دێرینم کرد . ئا لەو دەمەوە ، بیرم بۆ ئەوە چوو کە نەخش و ئاشراوەکان ، دەشێ پڕ لە هێمای جەنەنگی خۆمالي بن ، خۆ ئەگەر وانەبن هەر دەبێ بەو چاوەوە تەماشا بکرێن ، هەروەك چۆن ( نازم حیکمەت ) بۆی چووە لە بارەی ڕەخساندني ئەوینە تاکییەکە بۆ ئەوینێکی گشتي و مەودایەکی بەرفراوانی گەلبازی و نیشتمان پەروەری .

بەلکە ئەویستەکە فەرهاد قارەمانێکی خۆمالییەو ( شیرینی ئەرمەن ) یش زۆر لەبارە کە بە هێمای دابنێین بۆ وولاتی دراوسێ کە پێشتر بەشێك بووە لە ئیمپراتۆریەتی مادی گەورەو ( جۆگەی شیرە ) کەیش هەر بە گوێرەی هەمان بۆ چوون ، دابنرێ بە جەفەنگی ئامەزرۆیی و سەربەستي ویستني خەلکی ڕەش و ڕووت ، چونکە ( شیر ) هي دایکەو دایکیش هاوکێشەی زەوی و خاکە ، ئەگەر ئەوەشمان ، خستە پاڵ کە ( شاپووری نیگارکێش )و (فەرهادی سەنگتاش ) نوێنەری توێژی ڕۆشنبیری بن ، کە لە پێنلوی کۆکردنەوەی ڕووداوەکاندا تێدەکۆشن و لە چلە پۆپەی هەلچووندا، ئۆ بە ( خوسرەوی شا )ي نوێنەری چینی سەرەوە دەوەستن . هەر وەك هێمنی شاعیر دەڵێ :

**ئاخر ، خوسرەوان ، ئێمە مانان ئاخوێننەوە ، ڕوو لە مالي هەژاران ئاکەن ...** ) بەلام بەر لەوەی ، ئەرگاکە والایی و پێدەشتێکی بەرینتر بکرێتەوە ، باشێ وایە بە کورتی شتێك لە بنەڕەت و مێژووی ئەدەبی ئەو داستانە بزانین : بۆ ئەوەی بۆمان بلوێ کە لە ئاستانەی خاناي قوبادیدا لەتکەر بکرین . هێمن گووتەنی : ( **ئێستا ئەوەندەم بۆ ڕوون بۆتەوە ، خانا شیرین و خوسرەوی نیزامی ی ڕاستەوڕاست وەرنەگێڕاوە ، بەلکو ئازادانە چیرۆکەکەي کردوتە کوردی ، بەلام زۆر لە ئەسلەکە دوور نەبۆتەوە ..** )

هەر کاکە حەمەیش خۆی دوو دلییەکی سەیری لەلام بزواند وەك دەڵێ : ( **شیرین کیژی کوردستانە ... شیرین پەروەردەی شاخانە** ) کەچی هەر لە هەمان هۆنراوەدا دەڵێ : ( **شیرین کام بێچووە پلنگە ! خەلکی کوێیە !؟** )

بەلامەوە ، جێگا هەندە گرینگ نییە لەپاڵ ئەوەی بزانین (کێ یە؟ ) . ئەوەتا لە شاکارێکی وەك (هاملت)دا گرینگییەکی ئەوتۆ نادرێ بە جێگا مێژووینەکە ( دانیمارك ) ، بگرە هەر دەرهێنەرێك بۆی هەیە بە دانیشتووی وولاتەکەی خۆی دابنێ ، چونکە ئەبەردە ( صراع ) ئەزەلییە کە زالەو تراجیدیاکەش لە ناخي مرۆڤایەتییەوە هەلدەقولێ و بەرەو هەموو ناخەکان تەشەنە دەکات .

هەر لەبەر ئەوەی کە شیرین و فەرهاد بە ناوبانگترین چیرۆکی دلدارییە لە وێژەی کلاسی ی ڕۆژهەلات و بەلکو دەماو دەمیش ، خۆشخووانەکان دەیگێڕنەوە : ئەویش دەڵێم ، دیارە پێش تۆمار کردنی وێژەییش ، وەك زووربەی زۆری تراجیدیاکاني گریك و شەکسپیر و گۆتە ، لەناو خەلکدا ، پشتاوپشت گوتراوەتەوە ، لە لایەکی دیکەوەش ، سەرەڕای ئەوە کە فردەوسي پیش نیزامي گەنجەوی دەستي لەو کارەساتە وەرداوە کەچی ئەوشاکارە ، زیاتر بە ناوی گەنجەوییەوە ناسراوە . هەرچونێك بێ ، با گەشتێکی پەلە بە ناو هەر دوو وێژەی ( فارسي و تورکی )دا بکەین و بە راوردێك بخەینە نێوان خاناو ئەوانەی پێشووی ، لە پاشانیش ، بە چاوێکی سەردەمانە خۆ ئامادەبکەین بۆ خوێندنەوەیەکی نوێ ، بەو ئاواتەی کە بۆرتری ( نیگار )ي کونجاوی ئەو شاکارە لە هۆشمانا هەلبواسین ، ئەوەش دەڵێم کە لە لێکۆلینەوەیەکی ئەجۆرە درێژو بەرفراواني وادا – بەتایبەت لە فارسیش کۆلەوارم – هەردەبێ ڕاگوزەرانە ، سەرەندم بە دەستەوە بێ و ملي ئەو ڕچە ڕێیانە بگرم کە دامبەنەوە سەر شارێکە ، بە هیواشم کەسێکی تر چاکی هەردایەتی بەلادا بکاو نەك هەر بە بۆزنگ بەلکو بە هێلەك بێتە مەیدانەوە .

## ١ – لە وێژەی فارسیدا

**فردەوسي : لە سالی ١٠٢٥ ز .**

کۆچی دوایی کردووە . چیرۆکەکەی بۆ یەکەمین جار لە ( شانامە ) مەزنەکەیدا تۆمار کردووەو ئەم خالانەی خوارەوە لە شاکارەکەیدا بەدي دەکرێن :

ا – داستانێکی هۆنراوی مەرخاسي و حەماسییە لە بارەی خوسرەوی شاوە .

ب – مهین بانو ، کەسی یەکەمی

دیارەو ئامۆژگاریی شیرین دەکات .
ج ـ شیرین کەسێکی دووەمی خۆپەرستە کە لەبەر ( غیرة ) ی خۆی ( مریەم ) ی ژنی خوسرەوی کچی شای ڕۆم دەکوژێ .
د ـ دلدارییەکەی سیمایەکی سێکسی وەرگرتووە .

**نیزامی گەنجەوی**

لە سالی ١٢٠٣ ز . کۆچی دوایی کردووە . چیرۆکەکەی بە هەندێ گۆڕینەوە لە فردەوسی وەرگرتووە، بەلام مۆرکی کارامەیی‌و شەقلی هونەریی بێ هاوتای خۆی تێیدا نواندووە ، بە جۆرێك ڕەخنەگران ڕەچەلەکی داستانەکە بەمەوە دەبەستن ، هەروەها بە ( خوای شیعری فارسیی ) دادەنێن .
چیرۆکەکە لای نیزامی بەم جۆرەیە :
ا ـ شەخسیەتی فەرهادی داهێناوەو چیرۆکەکە هێمای دلداریی ئەفلاتونییە .

ب ـ داستانێکی هۆنراوی دلداریی ئەفلاتونییە .
ج ـ خوسرەو لە خەودا ئەنوشیروانی باپیری دەبینێ‌و لەبارەی : ( شیرینی بێ‌مانەند ـ شەودێز ـ تەخت‌و تاراجی بنەمالەـ باربود ) ەوە ، ئاگاداری دەکات .
د ـ شیرین داوێن پاکەو نموونەی وەفاداری‌و دلسۆزییە ، کچ برای مهین بانوی فەرمانڕەوای وولاتی ئەرمەنە . ئەشمیل‌و دلفرێنە وەك ( گولێکی تازە پشکووت ، لێو ئال‌و ناسك ، میراني جیهان لە فرمانیشتی ئەودان ، حەفتا کەنیزەکی جوان وەك پەروانە لە چەقیدا دەسوڕێنەوە ) .
هـ ـ شەودێز ، ئەسپێکی ڕەسەنی خوسرەوەو ( گول گون ) یش ماینێکی ڕەسەنی شیرینە .
و ـ کاتێك شیرین نیگاری خوسرەو دەبینێ ، تیری کیوپید دلی دەپێکێ ( ئەم نیگارەم بدەنێ‌و هیچم لێ مەشارنەوە . هەمیشە چاوی بە نیگارەکەوە بوو ، نەیدەتواني دەسبەرداری بێت ، لە هەر تێڕامانێکی نیگارەکەدا لە هۆش خۆی دەچوو ... ) ناچار کەنیزەکەکان بۆ ئەوەی ( دیلی نیگارەکە نەبێ‌و نەچروسێتەوە ) نیگارەکەیان دڕاند ، بەلکو ( وێنەی خاوەنەکەی لە مێشکیا کال بێتەوە ) .

## ٢ ـ لە وێژەی تورکیدا

**لامعي**

لە سالی ١٥٣١ ز . کۆچی دوایی کردووە .
ا ـ چیرۆکەکەی هۆنراوی دلداری‌و دلێرییەکە بە دەسکارییەو لە گەنجەویی وەرگرتووە .
ب ـ خوسرەو شا قارەمانی سەرەکی نییە .
ج ـ فەرهادی شەیدا پالەوانێکی دلێرو دلپاکە .
د ـ شیرین پەرییەکی ئاسمانەو نوقمی دەریای عیشقێکی یەزدانییە.
ئەم شاکارەی لامعي لە سالی ١٨١٢ دا لە لایەن ( فون هامر ) ەوە ، بە ناوی ( فەرهاد نامە ) گۆڕدراوەتەوە سەر زماني ئەلماني .

**شەیخي**

ئەمیش دیسانەوە ، بنیاني



چیرۆکە هۆنراوەییەکەی لەسەر ئەوەی نیزامی دامەزراندووە ، بەڵام بۆی تەواو نەکراوەو لەپاشان ( جەمالی) ی خوشکەزای کۆتایی پێ هێناوە .

أ – چیرۆکەکە تارماییەکی سۆفیزمانەی بەسەردا کێشراوە : ( کاتێك ئەو باڵا ڕەو زیوینە گەیشتە کێوی بێستوون ، ئەو چیا بەردینەی هەڵکەڕاندە بەهەشتێکی ڕێحانە ) بەڵکو هەست بە ئەوینێکی لاهوتی دەکەین : ( کە پریشنگی خۆر لە ڕوویا ڕەنگی دایەوە ، بەرد بووە یاقووت و کێوەکەش بووە مزگەوت ) .

ب – شیرین هێمای خاوێنی و بێگەردی و نموونەی عیشقی یەزدنییە :

(تاوێرە سەنگینەکان لە ڕۆشنایی نووری ئەودا ، دوولەت دەبوون و چیاکە خاپوور بوو ) .

ج – فەرهاد شاعیرێکی وێڵ و شەیدایەو بە زوبانی ( شەیخی ) یەوە دەدوێ : ( بەم چێژەوە ، گیان گاتێکی کامەرانی چنگ دەکەوێ ، دەی ، هۆنراوەی شادیمان بۆ هەڵڕێژە ) یان ( کە بادەکەی گرتە دەست و خواردییەوە ، گیانی بۆ نیو سەعات کەوتە نەمرییەوەو ووتی : کام مەیی جۆبار وەك شیرینە ، نۆشکەرەکەی ناخاتە نەمرییەکی هەمیشەیی ؟ )

**جەلیلی و ئاهی** :

ئەم جووتە کەڵە شاعیرەش دیسانەوە بە ناوی (فەرهاد نامە)وە ئۆمای هۆنراوەیان ناوداوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی پشتیان بە پێشینیانیان بەستووەو جیاوازییەکی ئەوتۆیان دیار نەخستووە ، بۆیە هیچی نوێم لە باریانە بۆ نەووترا .

**نازم حیکمەت** ( ۱۹۰۲–۱۹٦۳ ) ز.

ئەم شاعیرە مەزنەش لە وێژەی نوێی تورکیدا ، داستانێکی قنجی شیرین و فەرهادی بە ناو (چیرۆکێکی دڵداری ) لە ساڵی ۱۹٤۸ دا بۆ شانۆ سازاندووە ، کە دەتوانم بڵێم یەکەمین کەسە بە پەخشان و بۆ مەبەستێکی دیاری کراو ، ڕواڵەتی داستانەکەی چەشنی هەویر هەڵشێلاوەو مەودایەکی بەرینتری پێ بەخشیوە ، وا لەم خاڵانەی خوارەوە کۆیان دەکەمەوە :

أ – هەر وەکو ووتم شانۆگەرییەکە بۆ یەکەم جار بە پەخشان نووسراوە .

ب – دەسکاریی لە گەوهەرو ڕێڕەوی داستانەکە کردووە . لای ئەم مەتەڵی خوسرەو شاو شیرینی جوان نییە ، کە ئینفعال و هەستی بە یەك گەیشتن و نامرادیی دوو دڵ بێت ، وەك فردەوسی دەری خستووە ، هەروەها یەك گرتنی شیرین و فەرهاد نییە بۆ ئەوەی لە شاخەکەوە ( هەموو بەربەیانێك شیری تازە بدۆشن ) وەك نیزامی ئۆماری کردووە ، لە پاشانیش مێردکردنی شیرین و خوسرەوو درۆ بە هەڵەبردنی فەرهاد نییە لە لایەن پیرەژنێکی سەر ئاسنینەوە ، بەڵکو چیرۆکی ( مەهمەنە ) ی شابانوییە لە پێناوی ( شیرینی ) خوشکیا ، جوانییەکەی خۆی بۆ دەکاتە قۆچی قوربانی .

بێگومان نازم حیکمەت ئەو خۆبەختکردنە سایکۆلۆجییە بێدەنگەی کردۆتە تەوەری کێشمەکێشی شانۆگەرییەکەو بەبڵاوییەکی مرۆڤایەتی و هونەریی پێداوە . لە پاشان کێشەو زۆرانبازییەکەی کردۆتە دوندی ژیاریی ، چونکە فەرهاد ئەوینە تاکییەکەی دەبەخشێ بە کۆمەڵ و ڕەنجی قولنگەکەی بۆ بەرژەوەندی هەزار و لانەوازەکان دەخاتە کار . بەواتایەکی دیکە ، قارەمانی چیرۆکەکەی لە بازنەی تەسکی خودەوە هاویشتۆتە ژیانگەی بێ سنووری گشتییەوە .

ج – کەسی ناپێویستی لابردووەو بڕێکی تری خولقاندووە. وەك : لادانی خوسرەو شا و شاپووری هاوسەری و داهێنانی شەخسیەتی ( مەهمەنە بانو ) . ئاشکرایشە کە جیاوازە لەو ( مهین بانو ) یەی پووری شیرین ، کە لە تێکستە کلاسییەکاندا هەیە .

د – شیرین لای نازم حیکمەت بە پێچەوانەی شیرینە بێ هاوتا (مثالي)کانی پێشوو ، کەسێکی واقعي و یەك لایەنە ، خۆ بەخت کەرە وەك مەهمەنەی خوشکی ، لە هەوەڵ دیتندا دڵی لە فەرهاد دەچێ کە مرۆڤێکی سادە وئاسایییە . چەند ساڵێك چاوەڕوانی دەکات ، بەیەك دەگەنەوە . لەپاشان فەرهاد بەتەرێکی جێ دێڵێ و ڕووەو کۆشك وتەلارەکەی دەگەڕێتەوە .

**لە وێژەی کوردیدا**

بە گوێرەی زانینی من و ئەو سەرچاوە کەمانەی کە چنگ دەکەوون ، لەم بوارەدا دوو تێکستی کۆنی کوردی لەمەڕ داستانی ناوبراو هەن ، یەکەمیان گوایە لە نووسینی میرزا شەفیعی جانەوەرەییە ، ئەز تەقەی سەرم دێ لەعاست ئەم شاعیرە کوردە کە پەنجا ساڵ پێش خانای قوبادی ژیاوە ! دووەمیانیش ( خوسرەو وشیرین ) ە کەی (خانای قوبادی)یە کە ساڵی ۱۹۷٥ کەوتە کتێبخانەی کوردییەوە . خۆ ئەگەریش چەند نموونەیەکی تازەش هەبێ ، وەك

ئەوەکەی (علی باپیر ئاغا) و هەندێکی تر ، بەڵام لەبەر کەمدەستی و نەبوونی تێکستی یەکەم لەلایەك و نیزمیی ئاستی هونەریی‌و گۆڕینی دەقاو دەقی تێکستە دواییەکان لەلایەکی دیکەوە ، ناچار ڕوو لە ڕکی قەد پاڵی خانا دەکەم و بە نموونەیەکی خۆماڵیی‌و ڕەسەنی ئەو شاکارەی دادەنێم .

هەر وەکو لە نموونەی (هاملت)دا ووتم ، جێگاو کەسان‌و ڕووداوی مێژوویی ، مەگەر لە قوژبنێکەوە ، ئەگینا کارێکی ئەوتۆیان بەسەر شاکاری وێژەییەکانەوە نییە ، چونکە ئەو شاکارانە خۆیان لە خۆیاندا ، جیهانێکی تایبەتی و یاساو دیالیکتی خۆیان بە خۆیانەوەیە ، بۆشم هەیە بڵێم کە قارەمانی ( وێژەیی ) ی واهەیە کەبوونی خۆی لە کەسێکی ژیاوی مێژوویی‌و ئارکیۆلۆجی پتر سەپاندۆتە سەر کۆهۆش ( العقل الجمعي)و بیری خەلکەوە ، بە جۆرێك لە جێگات بەدەر نەمریی خۆیان پاراستووە . لە هاملت بەولاوە ، زیۆس و پرومیسیۆس‌و گشت خواو نیمچە خواو قارەمانە دەستکردەکانی جیهانی . بەلامەوە ( شیرینی ئەرمەن ، فەرهادی کۆکەن ، خوسرەوی پەروێز ، پیرەژنی فەرهاد کوژ ) لەو بابەتانەن کە ئەگەر ڕەگێکی مێژوییان هەبێ ، لە هەر چاخ‌و سەدەیەکدا زیندوون وەك نێرگزو گوڵاڵەو بەیبوون‌و چەقڵ سەر هەڵدەدەنەوە و دەبنە ماك و هەوێنی ووشەی گەش و وێنەی بکۆر . بۆیە هیچ جێگای ڕامان‌و سەر سورمان نییە کە شاعیری بلیمەتی کورد ، خانای قوبادی تۆڕی خۆی هەڵداتە ئەو دەریایەو بە گەوهەرو مرواریی خۆی ، گەردنی وێژەکەمان بڕازێنێتەوە . خانای قوبادییەك ، هێمن گوتەنی : [ مەولەوی بەو هەموو شان و شکۆ ئەدەبییەیەوە . شورەیی لێهاتووە خۆی لەعاستیا بە شاعیر دانێ و لە مەجلیسیا سەر هەڵبرێ . شاکاری هونەری خۆی بۆ شیرین و فەرهاد تەرخان کردوە و داستانە پێنج هەزارو پێنج سەد بەیتییەکەی بۆ ئەو هۆنیوەتەوە [ ، ئەلبەت ، دیارە نەمری ئەو ئەوینەو کەسانە دەسەلمێنێ بۆ نەوەی دوارۆژ ، خۆ هەر چەندەمش خانای بەهرەمەند ، شیرین‌و خوسرەوی گەنجەویی کردووە بە کوردی بەلام « هەر کەسێکی بێلایەن بەراوردی ئەو دووانە بکات بەیەك ، ناچار ئەبێ دان بەو دا بنێ کە وەك ئەلێن ، هەر خوایان یەکێکە ، ئەگینا هەرگیزاو هەرگیز نیزامی ناگا بە قولە پێی خانا داو

ناتوانێ لەعاستیا بڵێ منیش هەم !!.. بەلام خانا کوردەو ڕۆلەی نەوەیەکی بێکەس و دووا کەوتووە .. » هەروەها لە جێگایەکی تردا هێمنی موکریانی دەڵێ : ( شتێك کە سەرنجی منی ڕاکێشاو ڕەنگ بێ سەرنجی هەموو شیعر ناسێکیش ڕابکێشێ ئەوەیە کە زۆر شاعیرانەترو عاشقانەتر دەستی بە کتێبەکەی کردووە و موناجاتەکەی تەڕترو پڕ سۆزترە لە ئی‌نیزامی ) هەر بۆ سەلماندنی بۆ چوونەکەی سەرەوەش نموونەیەك لە پێشەکییەکەی کاکە حەمە دێنمەوە ( ... دیمەنی جوان و وەصفی وردو دەربڕو ڕەوانبێژیانەی گۆشت و دەمارو پێستی پێ پۆشیبێ و خوێنی تێزاندبێ و گیانی کردبێ بە بەرا .. )

جا بابزانین خانای کورد چیرۆکەکەی چۆن دەدا بە گوێی ڕۆژگارداو دەیەوێ بڵێ چی . بۆ ئەم مەبەستەش ، هەر دەبێ بانوڕامایەکی ئاورینگی ئەو شاکارە بخەمە بەرچاو .

١ ــ خوسرەو تاقەنەی بە نازی پەرویزی کوڕی ئەنوشیروانی شای ساسانییەکانە .

٢ ــ پەرویز شایەکی بە ڕووالەت داد پەروەر بووە ، بۆیەکە خوسرەوی کوڕی زبان بە ڕەزو باخی هەژارێك دەگەیێنێ لە تۆلەی ئەو دا ،دەستو پای شەو دێزەکەی دەبڕێ ! زین‌و لغاوەکەشی دەبەخشێ بە زەرەر مەندو نینۆکی نۆکەرەکەی بەردەستی خوسرەویش دەردێنێ !!

٣ ــ شاپوور نیگار کێشێکی ناوداری ، بالادەستی ، جیهان دیدەیە ، بۆیە خوسرەو دەیکا بە پەیغام‌و نێردەی ڕازی دلی خۆی .

٤ ــ شیرین شازادەی نەسلی شاهانە ، لە مامز جوانترە ، شەنگە . پوریشی بێوەژنێکی حوکمڕانە لە کوهستانی نزیك دەریاچەی ورمێ .

٥ ــ شیرین دلێ لەخوسرەو دەچێ ، هەلدێ ، لەپاش چەند دەردە سەرییەك ، لەکۆشکی خوسرەو دا جێگیر دەبێ ، دوایی دەبێ بەژنی .

٦ ــ فەرهاد هەرزەیەکی سەنگتاشەو هاوڕێ گیانی بەگیانیی شاپوورەو لەکن یەك مامۆستا مەشق‌و وانەی هونەریان وەرگرتووە . شیرین دەبینێ‌و لەلای خۆیەوە ، گرفتاری ئەیسم و جادووی ئەوین دەبێ .

٧ ــ نەبەردو کێشەیەکی بێ پارسەنگ‌و نارەوا لەنێوان خوسرەوی ( شا )و فەرهادی ( گەدا ) دا دێتە کایە . خوسرەو بە هەرەشەو پارە

فەرهادی بۆ لاالدرێت ، لەپاشـــان بۆڕ دەدات .

٨ ـ بۆڕ دانەکەی شێوەی فێڵ و چاو بەستەکێو ـیلانێکی نـەگریس دەگرێتە خۆ ، بەو نیازەی فەرهادی شەیدا . دوور بکاتەوە لەو کێوانە ، لـــەلایەکی ترەوەش ، لووشـــی هەڵدێڕانو دڕندە ببێ ، ئۆو پەڵپو داوا کردنە بێ مانەندەکەی ، لــــە هەڵبەستنی جۆگـــــەی بەردینو تاشینی قەد پاڵی بێستوون ، بەلای خوسرەوەوە ، داوا کارییـــەکی دوو ســــەریی هێزاو سەرکەش بوو . یەك : لە گفتەکـــــەی درۆزنن دەر نـــەدەچوو ، دوو : ئابرووی خۆشی دەپاراست لەناو خەڵكو دەربار دا.

٩ ــ شێرۆیەی کوڕی خوســرەو لەمریەمی کچی قەیـــــەری ڕۆم ، باوکی دەکوژێ بەو گەندە ئاواتـــەی کە شیرینی باوەژنی لە خۆ مـــــارە بکات !!

١٠ ــ خوسرەو کە دڵنیـــا دەبێ لە پاشگەز بوونەوەی فەرهاد ، پیرە ژنێکی جادووکار دەنێرێتــــــە لای فەرهاد ، ئەویش هەروەکو پەپوو ، هەواڵی مەرگی درۆزنانەی شیرینی پێ دەڵێ . فەرهاد لە حەژبەتا گیانی دەر دەچێ و لەپاشـــان کارەساتێکی تراجیدی تر دووپات دەبێتەوە بــە خۆ کوشتنی شیرین لەسەر گلکۆی خوسرەو بەو نیازەی کـــە لەچنگی شێرۆیەی ناپاك دەرباز ببێت .

جا با بزانین ئەو داستانەی کـــە لە( ١٠ ) خاڵدا گردم کردەوە ــ لەو باوەڕەشدام کە زۆر لایــــەنی وردم پشـــــت گوێی خستووە ــ دەشێ بەچاوی ئەمڕۆمانەوە لایـــــەکی لێ بکەینەوە . بــــــەر لەوەی باری بۆ چوون و ســـــەرنجی خۆم دیاری بکەم ، دەڵێم : ئەو دڵدارییەی لە‌ناو کورددا باوە ، لـــەنێوان شـــیرین و فەرهاد ، دڵدارییەکی ئەفلاتونی و یەك لایەنییە کە فەرهـــاد گرفتاری دەبێ و خۆ ئەگـــــەریش ، گریمان شیرین بە پەنهان دڵی لەو چوو بێ ، هیچ بەڵگەیەکی زەق لەتێکستەکەدا نییە ، بۆیە دەتوانم شاکارەکەی خانا لەمەڕ شیرینەوە ، بـــە ڕەووشت بەرزی دابنێم ، بــەڵام نووسەرێکی نوێ بۆی هـــەیە ، دڵدارییەکی بێ هاوتاو پیرۆز لەنێوان ئــــەو دوو دڵەدا ببەستێت و بۆ مـــەبەستێکی دیاریکراوی هەمە جۆرە بیخـــــاتە ڕووە ئەساش بێگومان کێشمەکێشو نەبەردی نێوان فەرهـــادو خوسرەو تەوژمدارترو تر ســـــناکتر دەبێ ، بەهەر حاڵێك ئــــەوە باسێکی ترەو هەڵێکی تری گەرەکە بۆ توێژینەوەو ذەمە تەقێ ، بۆیە ئێستـــا هەر لــــە سنووری ئـــــەو ( دە ) خـــاڵەی سەرەوە ، هەنگاو هەڵدەگرم .

(١)ــ خوسرەو کوڕی هــــەر کەسێك بێو ســــەر بەهەر جێگاو نشینگەیەك بێ ، شتێکی ئـــەو تۆ لەکێشە سەرەکییەکە ناگۆڕێ بۆیــە دەشێ لەهەر کـــاتو جێگایەکدا بنووسرێ و بۆ چـەندین مەبەستو چەمك بڕەخسێنرێت بـــەڵام بێ ئەوەی سایکۆلۆجییە تایبەتییەکانی کەسانی ناو جیرۆکەکە [ شازادەیە ، تاقانەی بەنازە ، فرە ژن خوازە .. هتد ] بشێوێندرێت . هـــەر وەك چۆن ئەمڕۆ (تعامل) لەگەڵ زوربەی تراجیدیەکانی گریكو شـــەکسپیر دەکرێت بـــە گوێرەی تیورو بـــۆ چوونی هونـــــەریی و فەلسەفەی نووسەران و دەرهێنەران .

(٢)ــ وەتم پەرویز شا ، بــــە ڕووالەت داد بەروەر بووە ، چونکە لەبری ئـــــەوەی سزایەکی توندی خوســـــرەو بدات ، سەرزەنشتی دەکات !! دەســـتو پای شـــەو دێزەکەی دەبڕێ !! باخەوانەکـەش بە زیوو زێڕی لفاو و نـــەرمە زینی شەودێزەکە دڵخـــۆش دەکات .. نوخاتی نۆکـەرەکە هەڵدەکێشێ !! کە لەڕاستیدا ؛ نە شەو دێزەکـــە گوناهی بووەو نە نۆکەرەکەش . ئەم دیـــاردەیە ، شـــاهانەیەو دەشێ لەنووسینەوەیەکی سەردەمدا ، بۆ چـــەند مەبەســـتێکی دیاربکراو بنوێندرێتو کەڵی دوو سەرەی لێ وەربگیرێت .

(٣)ــ شاپوور ، بەلامـــــەوە ، کەسێکی گرینگەو سایکۆلۆجییەتێکی تایبەتی هـــەیە کە دەگونجێ ڕۆڵێکی ئیجگـــــار مەزنو کاریگـــەری پێ بسپێردرێت . پێشان یەکێك بووە لە هاوسەرانی خوسرەو ، تـەنانەت هونەرمەندی کۆشكو ئەمپەسادۆری نهێنیی دڵی شـــاش بووە ، بۆلای شیرین لەپاشان ، لەو پایە بڵندەوە دادە بەزێتە توێژی فەرهـــــادی کۆکەنو بگرە دەبێتە ڕێ ئاسانکەری نێوان لەو وشیرین ، هەروەها لــــە نووسینەوەیەکی نوێی ئەم شاکارەدا زۆر لەبار دەبێ ئەگـــەر گرینگیی تەواو بدرێت بە هونەر ( شاپوور ، فەرهاد ، باربود ، نکیســـا ) یان خولقاندنی کەسانی دیکـــەش بۆ هەمان مەبەست .

(٤)ــ زانینی زێدی شـــیرین و هاتنی بۆ ( مدائن )و ( قەســـری شیرین ) ی ئێستا ، دەشێ تەوزیف بکرێت بۆ پەیوەندیی نێوان گـەلانی دراوسێ ( شـــیرینی ئەرمـــەن ، مریـــەمی کچی قەیـــەری ڕۆم ، شەکەری ئەسفەهانی ) یانیش بـــە پێچەوانە ، بۆ نیشـــانداني دیوی ئەوبەوەی خوســـــرەو وەك ( ژن هێنانی ڕامیاری ــ مریەم ــ دەست

بەسەرا گرتني وولاتی بێ جێگر ـ شیرین ـ سێکس و گەڕان بەدوای جوانیدا ـ شەکەرەی ئەسفەهانی ـ زیندوو کردنەوەی عەرشي باپیران ـ دیتني ئەنوشیروان لە خەوندا ) .. هتد .

(٥)ـ واقعییەتەکەی شیریني خانا پێش ئەوەکەی نازم حیکمەت کەوتووە . دڵی لە خوسرەو دەچێ ، ڕوو لە مەداین دەکات ، خۆی بەدەستەوە نادات ، خوسرەو ناچار دەکات پاش مردنی مریەم و چەند ڕووداوێکی تر ، مارەی بکات . کە خوسرەوی مێردی بە دەستي شێرۆیە دەکوژرێ ، ڕق و کینەی لێ هەڵدەگرێ ، ئەنجامیش خاوێنیی خۆی دەپارێزێ .

(٦)ـ خانای قوبادی لایەکی باشی لە هونەر کردۆتەوە ، تەنانەت مامۆستای بۆ هەردوو ( فەرهادو شاپوور )یش دیاری کردووە لەلایەك ، هونەری نواندني بە هۆی (نکیسا)و ( باربود )ی خۆشخوانەوە دەرخستووە لەلایەکی دیکەوە . ئەم دوو کارە لەو سەردەمەدا ، جێگای شانازیی ئەدەبەکەمانە ، بەلام هەر وەکو دەرم خست کە دلداریەکەی فەرهاد یەك لایەنی بووەو شیرین ئەوی بە برای خۆی داناوە ! لەمە هیچ ڕێگا لەوە ناگرێت کە بە ئوسەری نوێ دەست لە داستانەکە وەربدات ، وەکو ئەوەی شیرین لەبەر زۆر داریو داوێن پیسیو چەند هۆیەکی تر ، دڵ بگۆڕێ و سەوداکەی خۆی بداتە فەرهادی دەس ڕەنگین و دڵپاك ، وابزانم ئەمیش مەنتقێکی بەجێیە ، بە تایبەت بۆ ئەوەی خۆیشي لە داو و دڵڕەشی شێرۆیە ڕزگار بکات .

(٧)ـ دلداریەکەی فەرهاد

لەقۆلێکەوەو بوونی خوسرەو و ئاگاداریی ، لەقولێکی ترەوە ، چلە پۆپەی کێشەکەیە . لێرەدا خوسرەوی بارام بەزێن بەلامەوە وەك لەگۆشت و ئێسك نەبێ وایە ! خۆ هەر چەندەش شیرین بێ ئاگا بێ لەم کارە ، بەلام دەنگ و سەدای دلداریی فەرهاد بۆتە بنێشتە خۆشەی ئەم و ئەو . دیارە خوسرەو قارەمانێکی تراجیکۆمیدیە . ئەگینا بۆ فەرهادی کلۆڵی زیندە بەچاڵ نەکرد !! یا چلکاو خۆرێکی خۆی گاڵ نەدا کەوا بەرۆژی نیوەڕۆ بیکەنە پەندی زەمانەو لەکەی ناموسي خۆی بشۆرێ !! ئا ئەم نۆرانبازیەی نێوان خوسرەوی زەبرو فەرهادی ڕووتە ، هەر چەندەش قێزنی بوو بێت ، شیاوی ئەوەیە کە بە هۆی مۆنۆلۆگەوە ، لە کون و قوژبنی و تاریکستاني ناوەوەی خوسرەو شارەزابین . سەرەڕای ئەوەش گۆڕەپانێکی تەختە بۆ بەگژا چوونی چینایەتی نێوان فەرهاد ( نوێنەری چینی ژێرەوە ) وە خوسرەو ( نوێنەری چینی سەرەوە ) بێگومان شیرین ئەوساکە دەبێتە هێمای و نوێنەری سەرفرازیی و هەڵبژاردنی خۆ نەدۆڕان .

(٨)ـ پیلانە دوو سەریەکەی خوسرەو دیسانەوە نموونەیەکی بەلگە نەویستە بۆ تاوانبار کردنی ستەم و دەروون حلکنی و بۆلەلیقەو چاو چنۆکی و بەرژەوەندی دەرەبەگایەتی من وای بۆ دەچم کە تونیل و جۆگا بەردینەکە ، هەر چەندەش بەڕووالەت لەبەر ویستي شیرین بووە . بەلام لە ڕاستیدا ناماقوڵ بووە ئەگەر بۆ ئاوداني زەوی و زارەکانی شاهانە نە بوو بێت . دیارە تاشین و هەڵکەندني قەد پالي بێستوونیش هەر بە ویستی خوسرەو بووە چونکە زوربەی زۆری ناوەڕۆکەکان ، بۆ نیشاندانی دەسڕۆیی و دلێریی و جەنگەکانی خوسرەو تەرخان کراوە! ئەگەر بۆشم بچیتە سەر ، ئەوا ئەو تاشراوانە بە(کەوانەی سەرکەوتن)دا دەنێم لەمەڕ دەستەلاتی شا خوسرەو . ئالێرەدا کۆلنەدانی فەرهادو هەڵکۆلینی ئەو هەموو داستانە بەردینەی بێستوون نیشانەیەکی هەرە مەزني ورەی مرۆڤ دەردەخات و دەشێ مەودایەکی ستاتیکیی سەردەما ـ نەش وەربگرێت .

(٩)ـ شێرۆیە ، بەلامەوە نەخۆشیەکی دەروونیی ئێجگار ئالۆزی هەبووە ، بۆیە لەگەڵ لە عاستیا دەبەستم . خۆ ئەگەر پشت بە فردەوسي ببەستین ، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە شیرین هیچ نەبێ دەستی هەبووە لە کوشتنی مریەمي دایکی شێرۆیە ، جازۆر ڕێی تێدەچێ ، لەبەر ئەوەی شیرین ڕەدوو کەوت و لەو ژنە بووە کۆسپ لە نێوان دوو دڵ ، غیرەتی ژنایەتیش لەولاوە بمێنێ . جا کەشێرۆیە بەم کەین و بەینە بزانێ هەر دەبێ تۆلەی دایکی بکاتەوە ، بەلام لەکێ ؟ نەخۆشیە سایکۆلۆجیەکە ئا لێرە دایە ، دەبێ بێ مارە بڕین دەست

بەسەر شیرینـــا بگرێت ، هـــەر چـــەندەش لەخۆی بەتەمەنترە . ئەوسانی خوسرەوی باوکی تەگەرەو

لەمپەرێکی گەورەی چەقی نیـــازە گلاوەکەیەتی ، کەوا بوو پێشان بـا باوکی بکوژێ ، جا ئـــەم ئاکامەش بێجگە لە دەسکەوتە گەندەکەی کـە

باسم لێوە کرد . دەبێتە هۆی ئەوە کـــە بچێتە سەر تـــەختو تاجی شاهانەی لەســـەر کرێت . بۆیە

دەمودەســـت و بـــە هاریکاریی کۆمەڵێکی نارەسەنو هەلپەرستو بێ فەڕ . بێلانە گلاوەکەی مێشـکی جێ بەجێ دەکات. لێرەدا دەپرسم :

چ جیـــاوازییەك هەیە لـــەنێوان شێرۆیەو ئۆدیب ؟ ئەگەر تاوانەکەی ئـەم لـــە هی ئـــەو ناپەسندترو

دۆزەخانەتر نەبێ !! چونکـە ئۆدیب بە کارەساتەکەی نەدەزانی و ئـــەم

خۆی ئانو بۆی کارەساتەکەی دانـا بوو . شەخسـەتی ( شـــێرۆیە )

ئاناسیی و زۆری بە بارەوە هـەیەو دە گمەنیشە بۆ هەڵسوڕاندنی لایەنی ســـایکۆلۆجی و ڕامیـــاریی و کۆمەلایەتی وسێکسی ڕووداوەکان .

(١٠)ــ ڕاگـــەیاندنی مـــەرگی درۆزنانەی شیرین بە فەرهاد لەلایەن خوسرەوەوە . بەلگەی دڵ کـــرمێ

بوونی خوسرەو دووپات دەکاتەوە ، کەوا بوو کۆتایی ئەمتراجیدیـــە خوێنینە بە جۆرێك لێك دەردێتەوە

کە ڕاستگۆیی‌و ئەویـــنو وزەی فەرهاد و خاوێنی و دلـــسۆزی‌و

سەربەستیی شیرین دەسەلمێنێ لەلایەکەوە . لە لایەکەی تـــردوە دلڕەشی‌و ســـەلەکـــە بـــازیو

ســـنەمکاریی خوسرەوو دزێویی‌و خۆ فرۆشتنی فەرهـــــاد کوژان ئاشکرا دەکات ؟

لەکاتێکدا ئۆدیبو شێرۆیـــەی بیژوو و چەندانێکی تر دەبن بـــە پەندو گرێ کوێرەی دەروونـــە ئالۆزەکان . من گوتەیەکـــی شەکسپیر دەخوازم کە دەڵـــێ : **[ ژیان بێ ناپەسندەکان ، ناتەواوە]** کە ڕاستەو خۆ بە کرۆکی ململانێ‌و بـــەگژا چوونی پـــەیوەندییەکانی کۆمەلایەتی دەزانـــم . هـــەر کۆتاییشدا بەزوبانی ( هـــۆراس)ی ڕەخنەگرەوە دەڵێم : [ **دونیـــا** کۆمیدیایە بۆ ئەو کەسەی بـــیر **دەکاتەوە ، تراجیدیاشە بۆ ئەوەی هەست دەکات]** .

*

**سەرچاوەکان**

١ ـ گۆڤاری بـەیان . ژمـارە ـ ٥ . ١٧ ، ٣٤ ي سالاني ١٩٧١ ـ ١٩٧٤ ـ ١٩٧٦ .

٢ ـ شـــیرین‌و فەرهادی خانای قوبادی ـ لێکۆلینەوە و لـەچـاپ دانی محمدی مەلا کریم ـ کـۆڕی زانیاری کورد . بەغدا ١٩٧٥ .

٣ ـ شانۆ گەریـی ( الآلـــة الجهنميـــة )ي جان کۆکتۆ . گۆڕین وتێشەکەی میخائیل بشاي .

٤ ـ شانۆ گەریی ( قصة حب)ي نازم حیکمەت ـ گۆڕین وتێشەکەی اکمل الدين احسان .

٥ ـ (شکســـــبير معاصرنا) گۆڕینی : جبرا ابراهيم جبرا .

قوتابخانە میللی یەکان ڕێ و شوێنێکی پەرەسەندووی لە ڕێ و شوێنەکانی دەوڵەتی نیشتیمانی .

قوتابخانە میللی یەکان نواندنێکی زیندوانەی بیروباوەڕەکانی حزب و شۆڕشن




نووسینی

یان تۆمێش

وەرگێڕان و

ئامادەکردنی

محمد عارف


# گۆگان

● هونەرمەندی فەرەنسی مەزن (پۆل گۆگان) : یەکێکە لە هونەرمەندە هەرە بەناوبانگەکانی فەرەنسا . کە لە بەشی دووەمی سەدەی رابوردو دا! زیاوە ورۆڵێکی گرنگــــی لــــە هونەری پلاستیکی ئەم وولاتـــەو جوولانەوەی هونــــەری ئەورویی بینیوە.

چەندەها لێکۆڵینــەوەو کتیب دەربارەی ژیانی گۆگان نووســراون و رۆناکی خراوەتە سەر بەرهەمە جۆر بە جۆرەکانی ، لــــە گۆڕەپانی نیگار کێشانو پەیکــــەر تاشیو سیرامیكو وێژە دا .

ئێمە کە باسی بەرهەمی وێژەیی گۆگان دەکەین ، ناتوانین ئەم بەرهەمە تەنیا لە جوارچێوەی نامە بەناوبانگەکانــی دا دیــل بکەبـــــن ... چونکـــــە لە تەنشت ئەمانەشەوە ، دەفتەری یادگارەکانی هونەرمەنــدو ئەو کتیبەی لەگەڵ ( شارل مۆریس ) پێکەوە دایان ناوە وبەهۆی شیمرو بەخشانەوە ئیمپرێشنو یادگارەکانی خۆیانیـــــان لە دوورگەی سەیری ( نوا ــ نوا ) دا باس کردووە .

لەم دوایدا ئەم کتێبە وجه ـــد

کتێبێکی ئەدەبی گۆگان وەکو ( شارستانیەلی ) پالینیزی ، واتە ـ ماوری ـ کۆن ) وکتێبی ( هونەرمەندان وبەرهەمەکانیان )، چەند جار لە چاپ دراونەتەوە .

گۆگان هەر لە تەمەنی منداڵییەوە، حەزی لە دیتنی وڵاتەکانی دوورو دوورگەکانی نەناسراو دەکرد . یەکەم کە شتی هونەرمەند لە تەمەنی چوار ساڵیدا دەستی پێ کردووە ، ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەوە بوو ، کە باوکی گۆگان ناچار کرا نیشتمان بەجێ بهێڵیو ڕوو لە غەریبی بکات . پاش ئەم ڕووداوە ، بۆ ماوەی چەند ساڵێك ، گۆگانی بە کەشتییە بازرگانیەکان ، لە نێوان ( پەناما مارتینیكو دوورگەی تاهیتیو مارکیزو ـ خیفا ـ ئەوا ـ ، هاتو چۆی دەکرد ، تا لە کۆتایی دا لە دوورگەی ـ خیفا ـ ئەوا ـ دا ، بە هەژاریو نەخۆشی وتەنهایی ، گیانی بە خاك سپاردووە .

● ئەفسەری ئیسپانیایی ناو ( دۆم مارینۆ تریستان) ، کچی مامی شاهی پێشوی وڵاتی ( پیرۆ )ی خواستبوو ، کچێکیان بوو ، ناویان لێنا ( فلۆرا ) ، کە لە تەمەنی شازدە ساڵیدا ، مێردی بە پیاوێکی دەوڵەمەند کردووە لە پاریس ، وە تەنیا سێ سات لە گەڵیا ژیاوە . ( فلۆرا ) کچێکی بووە ناوی ناوە ( ئالین ) ، کە لە دوایدا مێردی بە ڕۆژنامە نووسی لیبرالی (کلۆفیس گۆگان)ی خەلکی (ئۆرلیان) کردووە. گۆگان لەم خێزانە دا لە حەوتی حوزەیرانی ساڵی ١٨٤٨ دا ، لە دایك بووە .

● گۆڕینە سیاسییەکانی کاتی ( لویس پوناپارت ) ، کارێکی ناڕەوای لە ژیانی باوکی گۆگان کردووە ، کە ناچار بووە ڕوو لە وڵاتی (پێرۆ) بکات ، بەڵام لە ڕێگا ، پێش ئەوەی بگەنە جێگا ، لە دەریا دا ، کۆچی دوایی کردووە ، خێزانی گۆگان لە ( پیاتریستان مۆسکۆزۆ ) بۆ ماوەی سێ ساڵ ژیاون ، لە پاشان گەڕاونەتەوە فەڕەنسا .

گۆگان لە تەمەنی حەقدە ساڵیدا بۆ ماوەی دوو ساڵ ، لە دەریا دا گەشتی لە نێوان ئەورووپای خوارو وکاڤر وریۆدیجانیرۆ و یاپابلانکا وئەورووپای ژووروودا کردووە . ئەم هەموو گەشتانە کارێکی تەواوی لە دەروونی هونەرمەند کردووەو لە بەرهەمە هونەرییەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە . هەر لەم قۆناغە دا بوو ، ئەفسەرێکی دەریایی ، باسی زەمینە فانتازییەکانی دوورگەکانی ئۆقیانۆسی ( هێمن ) بۆ هونەرمەند گێرابۆوە وئەمەش بەخەیاڵی بینینیان دەژیا .

گوگان لەم ساڵانە دا ، بۆماوەی ( ٢٧ ) مانگ لە سوپای فەڕەنسی وەك سەربازێکی دەریایی ، خزمەتی کردووە و لە مانگی نیسانی ساڵی ١٨٧١ دا بووەتە فەرمانبەر لەیەك لە بانکەکانی پاریس ولە هەمان کاتدا بە هۆی بۆرسەوە پارەیەکی باشی قازانج کردووەو دەوڵەمەند بووە . لە ساڵی ١٨٧٣ دا ، کچێکی دانیمارکی ناو ( صۆفیاگاد ) ی خواستووە .

● پاش دە ساڵ لە ژیانێکی پڕ لە هێمنیو کامەرانی ولە پاش ئەوەی کە پێنج منداڵیان بووە ، گۆگان بڕیاریداوە واز لە ئیشی بانكو ژیانی فەرمانبەری بهێنێ ، هەموو ساڵانی ژیانی ، تەنیا بۆ هونەر تەرخان بکات.

ئەم هەڵوێستە بوێرییەی گۆگان ، ڕۆڵەی ئەو کاتانە بوو کە ڕەسمی دەکردو هەستی کامەرانییەکی دەروونی پێ دەبەخشیی ، هەروەها کارتێکردنی دەستەیەك لە باشترین هونەرمەندانی قوتابخانەی ئیمپرسیانیزم ڕۆڵی گرنگی خۆی لەم بڕیارەی گۆگاندا بینیوە . گۆگان بە دڵەوە ڕای لە تابلۆکانی برادەرە ئیمپرسیانیستە ـ کانی بوو وە کۆمەڵێکی نایابی لە نیگارەکانی ئەوانی کڕیوەو ماڵی خۆی پێ ڕازاندوەتەوە .

● ئەم بڕیارە شۆڕشگێڕانەی گۆگان، دەربارەی تەرخان کردنی ژیانی بۆ هونەر ، لە سەرەتا دا هیچ کارێکی ناڕەوای لە کامەرانی خێزانی نە کردبوو ، گۆگان بەوپەڕی باوەڕەوە وای دانابو کە لە ژیانی هونەریدا سەرکەوتوو دەبێ هەموو کاتێ خۆی بۆ نیگار کێشان تەرخان کردبوو ، لەو کاتە دا هونەرمەندی ئیمپرسیانیستی بەناوبانگ ( پیسارۆ ) ( ١٨٣٠ ـ ١٩٠٣) ، لە هەمان شاردا خەریکی نیگار کێشانی بوو . لە ڕاستیدا گۆگان بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە ژێر کار لێ کردنی ( پیسارۆ ) دا ئیشی کردووە .

( پیسارۆ ) یەکێکە لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی هونەری ئیمپرسیانیزم . لە سەرەتای ژیانی هونەریدا ، پشتی خۆی بە تاقیکردنەوەکانی هونەرمەندان :

(کۆرۆ)و(کۆرپێ)بەستبوو تاکوسالی ١٨٧٠هەرخەریکی لێکۆلینەوەو تاقی‌کردنەوەی هونەریی بوو لە گۆرەپانی ( ڕۆناکی‌و تاریکی ڕەنگەکاندا) . ( پیسارۆ )ناوبانگێکی باشی هەبوو ونیگارەکانی لە لایەن بینەرانەوە بە چاوێکی پر لە ڕێز تەماشا دەکرا .

● گۆگان بۆ ماوەی دە سال لە نیگار کێشان بەردەوام بوو ، وەك قۆناغێکی ئامادەیی کە بە ( قۆناغی ڕووان ) ناسراوە . لە ئەنجامی ئەوەی کە یەك لە تابلۆکانی ، لە (سالۆنی پاریس ) وەرگیرا ، ئەم ڕووداوە سیمفۆلی سەرکەوتنی ئەرك‌و ماندوو بوونی ئەم سالانەی بوو . بەلام بە داخەوە ئەم دەرگایە زوو بەرامبەری داخرا . لە تابلۆ ناسراوەکانی هونەرمەند لە ( قۆناخی ڕووان )دا . ئەمانەن :ـ

١ ـ ڕێگای دارستان، ١٨٧٣ ، لەم نیگارەدا کارتێکردنی هونەرمەند ( کۆرۆ ) شتێکی سرنج ڕاکێشەرە .

٢ ـ پردێك لە سەر ڕووبـاری ( سین ) ، ١٨٧٥ .

٣ ـ ڕۆخی ڕووباری ( سین ) ١٨٧٥ .

لە ڕاستیدا ئەم نیگارانەی گۆگان لەگەل بەرهەمە هونەرییەکانی قۆناغی ( پێش ئیمپر سیانیزمی فەرەنسی ) ، بە تایبەتی لەگەل نیگارەکانی هونەرمەند ( لیپین ) ، بەراووردی دەکرێن .

گۆگانی هونەرمەند ، لە سالی ١٨٨٠ دا ، تابلۆکانی خۆی لەگەل هونەرمەندە ئیمپرسیانیستەکان پیشان داوە . ( گیوسمان )ی ڕەخنەگر ، پەنجەی بۆ ئەوە درێژ کردوە ، کە بەرهەمی هونەرمەندان ( بۆدین‌و ژۆنکین ) کاری خۆیان لە تابلۆکانی گۆگان کردووە ، بە تایبەتی لە تابلۆی ( دیمەنی پۆرتی دیپ ) ئەم شتە بە شێوەیەکی ئاشکرا ، دەردەکەوێ ، بەلام لە هەمان کاتدا ، گوگان ، عەودالی دۆزینەوەی ئەنجامی قوول تر بوو ، بەهۆی دەربڕینی زەمینەی پڕ لە لیشکی ڕۆژو سیبەرەکانی ( تۆن) ــ ـ ساردی .. هونەرمەندان ( مۆنێ پیسارۆ ، سیسلێ و ڕێنوار لە هەمان مەیداندا لە لێکۆلینەوەی خۆیاندا ،دلسوزانە بەردەوام بوون.

بەم شێوەیە ، فەرمانبەری دەولەمەندی بانك ، گۆگان ، ڕێگای سەختی هونەری گرتە بەر ... بەلام لە جیاتی ئەوەی کە هاودەمەکانی ڕێزی هونەرەکەی بگرن و تابلۆی لێ بکرن ... بە پیچەوانەوە ، بە چاوێکی نزم لە ماشای تابلۆکانیان دەکرد وکەس تابلۆی لێ نەدەکری ... تا بەرەبەرە پارەی بەرەو نەمان دەڕۆیشت وهەژاری ڕووی گرژی خۆی تێدەکرد .

ئەم هۆیانە وای لە هونەرمەند کرد ، بە دوای ئیشێکی بازرگانی لە دانیمارك دا ، عەودال بێت ... بەلام لە ئەنجامی ناکۆکی نێوان گۆگان وخێزانەکەی لە لایەك ، وەگۆگان وخەلکی دانیمارك ، لە لایەکی تر ، هونەرمەند لەگەل (کلوڤیس)ی کوڕی ، گەڕانەوە پاریس ، ژنەکەی ومندالەکانی تری ، لە دانیمارك بەجێ‌هێشت . ئەم ڕووداوەش ڕێکەوتی سالی ١٨٨٥ بوو .

لەم سالەوە ژیانی هەژاریی‌و تراژیدی گۆگان دەست‌پێ‌دەکا تا لە



کۆتایی دا ، هونەرمەند بووەتە ئەو کرێکارەی کە پۆستەر لە شەقامەکانی پاریس هەڵدەواسێ . بەڵام لەگەڵ ئەوەش‌دا ، گۆگان هەر دڵسۆز بووە بۆ هونەرەکەی ولەبەرهەمدا بەردەوام بووە و لە ساڵی ١٨٨٦ دا ، نۆزدە تابلۆی لەگەڵ هونەرمەندان ( دیگاو پیسارۆ) پێشان داوە وئەم بەرهەمانەش وای لەرەخنەگری ناو ( فیلکس فینون ) کردووە ، کە بەرێزەوە باسی بەرهەمی گۆگان بکات . بەرهەمی ئەم قۆناغەی هونەرمەند ، شێوەیەکی ئیمپرسیانیزمی هەلگرتبور ، هەر لەم ساڵە دا ، قوتابخانەی ناو (ئیمپرسیانیزمی زانستی) لە لایەن هونەرمەندان ( سیورا وسینیاك ) هێنراوەتە گۆڕەپانی هونەر دا .

● ( جۆن ڕیڤالد ) ئەم شتەی دەربارەی ژیانی گۆگان نووسیوە : ـ

« ... بەم شێوەیە گۆگان ، لە قەردو هەژاری هەڵات‌و ڕووی خۆی لە (پۆنت ئەڤینی بریتانی) کرد ، کە لە ژوورێکی بچووکدا دەژیا و نزیکەی حەفتا فرەنکی بەخاوەن ماڵدە دا ... ئەم ژیانە زۆر لە هی پاریس هەرزان تر بوو .. لە هەمان ماڵدا ، لەگەڵ هونەرمەندا ( ئەمیل برنار) پێکەوە ژیاون ولە دوایشدا کاری خوی لە بەرهەمی گۆگان کردووە . »

هونەرمەند کۆمەڵە ، تابلۆیەکی تازەی لە ( پۆنت‌ئەڤین ) ڕەسم کردووە ، کە لە ڕاستیدا بە دەرچوونێکی ئازایانە دەژمێردرێ ، لە دیلی چوارچیوەی قوتابخانەی ئیمپرسیانیزم ویەکەم هەنگاوی دەست نیشان کەرمان بیشان دەدا ، بو چۆنیەتی شێوازی دوارۆژی هونەری ئەم هونەرمەندە .

لە زستانی ساڵی ١٨٨٦ دا ، گۆگان ، گەڕاوەتەوە پاریس ، کە ژوورێکی سارد وخاوەن قەردەکان چاوەڕوانیان دەکرد . لە هەمان کاتدا (ڤان‌گۆك )ی هونەرمەندی لە دەست برسیەتی و هەژاری هەڵاتی ، تازە لە نێوان کرێکارەکانی خەڵووزی بەلجیکا ، گەڕابۆوە و لەگەڵ گۆگان یەکتریان گرتووەتەوە . لەم قۆناغە دا کە گۆگان بیوە سەنتەری یەکگرتنەوەی هەنەرمەندە هەژارو لێ‌قەوماوەکان ... بڕیاری کۆتایی هونەرمەند گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەبۆ یەکجاری ژیانی پایتەخت بەجێ بهێڵی‌و سەری خۆی بۆ ئەمێرکانی خوابڕوو هەڵبگرێ ... لە ( ١٠ )ی مانگی نیسانی ساڵی ١٨٨٦ دا ، ئەم بڕیارەی بە خێزانەکەی گەیاندوە ، لەگەڵ هونەرمەندی برادەری شارل لاڤال) ، خۆیان گەیاندوەتە ( پەناما ) کە وەك دوو کرێکار لە قورسترین ئیشی هەڵکۆلینی قەنالی پەناما بەشدار بوونە ، لە ئەنجامی ناخۆشی ونەگونجدا ، لەم ئیشە دەرکراون . ڕوویان لە ( مارتینیك ) کردووە . گۆگان گەلێك ڕای لەم جێگایە بوو ڕەنگەکانی پڕ لە تیشك‌و جوانی ، سروشیان داوەتێ وکۆمەڵە تابلۆیەکی نایابێ درووست کردووە ، کە پێشان خەونی پێوە دەبینێ . باشترین بەلگە بۆ ئەم قوناغەی هونەرمەند تابلۆی ( دیمەنی دوورگەی مارتینیك )ە کەلەساڵی ١٨٨٧ دا ڕەسمی کردووە .

● دەتوانین بە دلنیاییەوە ، کۆمەڵە تابلۆ ڕەنگینەکانی گۆگان لە قۆناغی ـ مارتینیك ـ دا ، لە گەڵ شیعرەکانی ( بۆدلیر ) بەراووردی بکەین ، وەك : ( دەموەت نامەیەك لە ڕێگادا ) ، ( دوور لەم شوێنەدا ) و (ڕێگا کە ) .. ئەم شیعرانەی کە بە بەرزترین نموونەی ـ شیعری دەروونی فەرەنسی سەدەی نۆزدەمین دەژمێردرێن .

بەم جۆرە گۆگان ، بو یەکەم جار ، ژیانێکی پڕ لە سروشی هونەر ژیاوە وبەرهەمێکی ڕۆژانەی هێناوەتە بوون .. جارویار ئەو نەخۆشی‌یەی کە لە پەناما دا تووش ببو ، سەختی دەکرد ، بە تایبەتی (شارل لاڤال )ی برادەری ، بە جارێك نە خۆشی هێرشی بردە سەرو بەرەو نەمانی بردووە تا ڕادەی ئەوەی لە ژیانی خۆی بیزار بووەو هەوڵی خۆکوشتنی داوە و تەنیا بە هەڵکەوت گۆگان ، توانیویە رزگاری بکات وبە یارمەتی دیپلۆماسی‌یەکی فەرەنسی گەراندویانەتەوە فەرەنسا .

لە ساڵی ١٨٨٨ دا ، گۆگان گەڕاوەتەوە پاریس ، بە دەست‌بە تالی ونەخەوشی بەڵام سامانێکی گەورەی ئیمپرێشنی لە میشك دا هەلگرتبوو . کۆنە برادەری گۆگان (شوڤینیکر) ، دەستی یارمەتی بۆ درێژ کردوە .

... ئەم کارە دەنگدانەوەیەکی جوانی لای گۆگان هەبووە ، کە بە هۆی تابلۆی ناو : ( خێزانی شوڤینیکر ) دەری بڕیوە، لە ساڵی ١٨٨٩دا . ئەم پیاوە نهۆمی سەرەوەی خانووەکەی خۆی بۆ گۆگان تەرخان کردووم . هەر لەم قۆناغە دا ، هونەرمەند لەگەڵ ( دانییل دی‌مونفرید) یەکتریان ناسیوە ، کە لە دوا ڕۆژدا بوونەتە دلسوزترین برادەرو گۆگان نامە ئەدەبییە

بەناوپانگەکانی خۆی بۆ ناردووە .

● گۆگان نەیتوانیوە ، بەم شێوەی باسکراو ، ماوەیەکی زۆر لە پاریس دا بژیی بۆیە سەرلەنوێ سەری خۆی هەلگرتووە بۆ (بریتانی) و (پۆنت ئاڤین) و بۆماوەیەك لە گەڵ کۆمەڵێك لە برادەرانو قوتابیانی خۆی لە دێیەکی بچووکی ماسیگران ،ژیاوە کە ناوی گووندی ( پۆلدۆ ) بوو .

ئەم کۆمەڵە هونەرمەندانەی باسکراو ، لە پاش ماوەیەك ، نازناوی ( کۆمەڵی قوتابخانەی پۆنت ئاڤین )ی هەلگرتووە . گۆگان لەگەڵ ئەم هەمو تاقیکردنەوە هونەرییانەی کە تا ئەم قۆناغەی ناوبراو بڕیویەتی ؛ بەڵام لە راستی دا نەیتوانیوە ، خۆی لە دیلی چوارچیوەی قوتابخانەی ئیمپرسیانیزم ڕزگار بکات ، بەڵام جورە ڕێبازێکی ـ ( سیمڤولی ـ ئیدیالی ) ، وەك وەڵام دانەوەیەکی هونەرێی ، دژی دیلیی باسکراو ؛ لای هونەرمەند بەرچاو کەوتووە . بەم جۆرە ئێمە دەتوانین بلێین ، کە هونەرمەند ماڵئاوایی لە قوتابخانەی ئیمپرسیانیزم لە سالی١٨٨٧کردووە بەڵام پێشەکیی ئەم ماڵ ئاواییە لە سالی ١٨٨٥ دەستی پیکردووە . بەرهەمەکانی هونەری ( سێورا وسینیاك ) هۆی گێژەلوکەی دەروونی هونەرمەند بوون و زۆر جار پاڵپیوەنەری ئەوە بوون کە گۆگان سەرلەنوێ بە قوولی بیر لە هونەرو ڕێبازی هونەری خۆی بکاتەوە . ئەم دوو هونەرمەندەی باسکراو ، هەوڵی ئەوەیان دەدا کە تیۆریای زانستی دەربارەی ڕۆناکی وڕەنگ لە تابلۆکانیان دەرببرن وڕێبازیکی بە زانست پشتبەستراو ، بۆ یەکەم جار لە



قوتابخانەی ئیمپرسیانیزم ؛ جێبەجێ بکەن . گۆگان عەودالی هەمان ئامانج بووە .

گۆگان تیری ڕەخنەی لە برادەرانی پێشووی گرتو دەیگوت کە ئەوانە لە ڕواڵەتی شتە بینراوەکان دەردەبڕن ، بێ ئەوەی کە بتوانن بگەنە ناوەڕۆکیانو نهێنییەکانیان بەرچاو بخەن .. ئەم وتەیەی گۆگان لە دوا ڕۆژ دا ، بووە شەقامی فراوانی هونەری نەڕەنسی لە کۆتایی سەدەی رابووردوو دا ، لە هەمان کاتدا ڕێگای بو هونەری سیمڤۆلیزم قیرتاو کردوە .

● لەم کاتە دا دوورگەی (بریتانی) ببوە مەلبەندی کۆمەلێك لە هونەرمەندان و وێژەرانو مۆسیقا ژەنەکان ... زەمینەی جوان و سرووشتی ڕەنگینی ئەم دوورگەیە . ببوە کانی سروشی ئەم بەهرەدارانە کە لە ئەنجامدا لە بەرهەمە تایبەکانیان بە شێوەی نیگارکێشانو شیعر و مۆسیقا دەربڕاوە .

لە گۆڕەپانی بایەخ دان بە شتی تازە . هونەرمەندان ڕوویان لە گرافیوری ژپۆنیو جامی ڕەنگاو ڕەنگ واتە ( ڤیتراژ ) کردووە ... لە ئەنجامدا سوود لە زۆر شت وەرگیراوە وئەمەش بووەتە هۆی دەمەتەقەو کۆششی سەرکەوتنی هونەری تازە کە نازناوی ( سیمڤۆلیزم) و ( ئیکسپرسیانیزمی) هەلگرتووە وبە کورتی دەلێ :ـ

«هونەر کۆپی کردن وچاولێکەری دەورو پشت نیە ، بەلکو هونەر سیمڤۆلێکە بو ئەوەی لە دەرونی مرۆڤ وسرووشت دەربڕێ بێ ئەوەی خۆی دیلی ڕوواڵەت بکات » . هونەرمەندان ( ڤان گۆگ ) . و (برنارِ) بەشدارییەکی گرنگیان لە درووستکردنی قوتابخانەی ئیکسپرسیانیزم کردووە .

● پەیوەندییەکی بە هێز لە نیوان گۆگان وبرنارِ هەبوو ،هەروەها ئەو پەیوەندییە هونەرییەی نێوان تابلۆی (ئافرەتانی بریتانی) برنارِ و تابلۆکانی گۆگان ، بە تایبەتی تابلۆی ( خەونیپاش ئامۆژ... )و ( زۆرانباری نێوان یعقوب وفریشتە) بۆ ماوەی چەند سالێك جێی گفتوگۆو دەمەتەقییەکی زۆر بوو لە سەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانی

ئەڕەنسا ، کە لە ئەنجامدا یارمەتی یەکی باشی پێشکەش بە جۆری ڕێبازو تێگەیشتنی هونەری تازە ، واتە ( مۆدێرنیزم )ی کردووە .

● تاکو بە شێوەیەکی ڕێکوپێك هەوڵدانی هونەری و سەلماندارتی بەرزی بێهاوتای گۆگان تێگەیین ؛ لە گۆ ەیانی هەنەری ئیکسپرسیا ـ نیزم ، تابلۆکی ( زۆرانبازی یعقوب و فریشتە) هەڵدەبژێرین وکەمێك باسی دەکەین :ـ ( ئەم نیگارە لە چەند پەڵە ڕەنگێك پێكهاتووە ڕەنگی سوور ، بەسەر هەمویاندا زاڵە ، تورلی سێیەم بەکار بەێنراوە ، هێڵەکانی دەرەوە Out Line ، ڕوواڵەتی شێوەکان لە پاشەکۆی تابلۆکەدا ، بە شێوەیەکی ئازایانە جیاواز دەکاتەوە وزەمینەی کۆنتراست جێبەجێ دەکا . پەر سپێکتیفی دووری ، ڕۆناکی وپلەکان ڕۆناکی ، ڕەنگ وپلەکانی ڕەنگ ، خراونەتە پشتگوێ . . .بەڵام ڕەنگی سوورو دۆزینەوەی پەیوەندی وبەستانەوەی لەگەڵ ڕەنگەکانی تر ، بەگوێرەی ڕژێمی کۆنتراست وپاڵپێوەنانی بۆ ئاستێکی ئەبستراکت ، وای لەم تابلۆیە وتابلۆ هاوتاکانی هونەرمەند کردووە ، کە بە کلیلی تێگەیشتنی هونەری هاردەم واتە هونەری ( مۆدێرنیزم ) دابنرێ .

هونەرمەند ، بە یارمەتی ( تیو )ی برای ڤانگۆگ ، هۆڵی ( بۆسوو ڤالادۆن)ی دەستنیشان کردوو نیازی ئەوەی هەبوو ، کە پێشانگای نیگارەکان لەم هۆڵانەدا نیشان بدات .

( تیۆ ) ئامۆژگاری گۆگانی کرد ، کە بچێتە لای (ڤانگۆگ)ی برای ، کە لەو کاتەدا ، لە خوارووی فەڕەنسا ، لە شاری ( ئارل ) دا دەژیاو خەریکی بەرهەم بوو ، بەم جۆرە گۆگان لە ( ٢٠ی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٨٨٨ بەرەو ( ئارل ) کەوتەڕێکا) .

گۆگان و ڤانگۆگ بۆ ماوەی دوو مانگ پێکەوە ژیانو هەمووڕۆژ ڕەسمیان دەکردو زۆر جار دەبووە دەمەتەقێ وگفتوگۆیەکی ئەووزمەاوی وئاڵوگۆڕی تاقیکردنەوەی هونەری لە نێوانیاندا بەڵام لە ئەنجامدا بووە شەڕو ناخۆشی و ڤان گۆگ هەوڵدانی کوشتنی گۆگانی دا ، لە حاڵەتێکی بەئەوزمی تووڕەبوون ، باشبوو کە گۆگان خۆی ڕزگار داو هەڵاتو سەرلەنوێ ڕووی لە شاری پاریس کردوە . .

لە ساڵی ١٨٨٩دا ، گۆگانی هونەرمەند دوو تابلۆی تازەی ڕەسم کرد ، کە سرنجی ڕەخنەگرانو هونەر دۆستانی بەتەوژاوی ڕاکێشاوە مەبەسمان نیگاری «مەسیحیزەرد»و « هەڵواسینی لە بریتون »ە .

وا دیاردەکەوی کە گۆگان ، چەند ناوەڕۆکی تابلۆکانی ( کوربێ )ی هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی بە ڕێبازی تایبەتی خۆی دەریان ببڕێ ، بە تایبەتی تابلۆی : « ڕۆژباش بەڕێز کوربێ » کە گۆگان ناوی لێناوە : « ڕۆژباش بەڕێز گۆگان » . (جۆن ڕیڤالد)ی ڕەخنەگر ، بەم جۆرە باسی گۆگان دەکات :ـ « گۆگانی هونەرمەند لە تابلۆ تازەکانیدا ، ئازایانە چارەسەری دامەزراندنی هونەری وئاسان کردنی هێڵەکان وڕەنگی پاك ودیکوری بەکارهێناوە. » تابلۆی ناو « دیمەنی ئارل » بە هەنگاوێکی تازەی پێگەیشتوو دەژمێردرێ ، هەروها تابلۆی « مەسیحی زەرد » ڕەنگەکانی بە شێوەیەکی ئەوتۆ هەڵبژاردراون ، کە هەستی خەمگینییەکی قووڵ بەخشنەبینەرو فیگۆرەکانی تابۆکەش دەستکارییەکی تەواویان تێداکراوە بۆ بەتەوژم کردنی هێزی دەربڕینیان .

لێرەدا هونەرێکی تازە لە دایك بوو ،کە وەکو باسمان کرد پێیدەڵێن هونەری « ئیکسپرسیانیزم » ، ڕەخنەگری فەڕەنسی ( ئەلبێرتۆ ئاری ) پەنجەی بۆ بنیاتدانانی ئەم هونەرە تازەیەی گۆگان درێژ کردووەو ڕەخنەگری ناو شارل ئارێن)یش ، پشتگیری هەمان شتی کردووە .

لەم قۆناغە دا پاریس ئامادە بوو کە تابلۆکانی هونەرمەند لە گالێرەیەکانی پیشان بدات وبینەران بە سۆزەوە دەیانویست بەرهەمە تازەکانی هونەرمەند ببینن . بەڵام ئەم هونەرمەندە کۆچەرە ، سەرلەنوێ بیری گەشتی تازەی دەکرد . بۆیەش کە (٣٠) تابلۆی فرۆشت وپارەی گەشتەکەی هاتە دەست ، لە دانشتنێکی ئێوارەیی غەمگین ، لەگەڵ برادەرەکانی ماڵئاوایی کردو لە چواری نیسانی ساڵی ١٨٩١ دا ، بەرەو دوورگەی (تایتی) کەوتە ڕێ .

بەم شێوەیە گۆگان خۆی لە ژیانی پایتەختو ئەتیکێتی پاریس ڕزگار کرد ، بەرەو سرووشتی ڕەنگین و پڕ لە تیشکیڕۆژ سەری خۆی هەڵگرت .

شاعیری بەناوبانگی فەرەنسایی «بۆدلێر» ، باسی زەمینەی ئەم دوورگانەی بەم جۆرە کردووە :ـ

**(( من ئەم دوورگانە دەبینم کە سرووشت هەمووی گوڵە . .**

**من میوەی وەها دەبینم کە لەسەر لیوّ دەتاوینەوە ...**

**من پیاوانی ئەوتو دەبینم بە هیّز وچوار شانەن ...**

**من ئافرەتانی وەهـــا دەبینــــم ئارەزوویەکی ئەوتو لــــە چـــاویان بریسکەی دیّ کە بیّهاوتایە ... »**

گوّگان لـــە دەفتەری یادگارەکانی ئەم شــتەی نووسیوە :ــ « پاش ٣٦ ڕوّژ لە دەریادا ، کەپلەی گـــەرمایی یەکجار بەرز بوو ، نزیك دوورگـــەی تایتی بوینەوە » . پاش مـــاوەیەك هـــونەرمەند ئـــەم ووشـــانەی نووسیوە :ــ

**« دیمـــەنە جوانەکانی ئــــەم دوورگەیە ، کە پڕی ڕەنگی ئاگرینی بە تەوژمن ، دیلیان کردم .. بەو پەری ئاسانیەوە ڕەسمم دەکردن ... ئەو ڕەنگانەی کە لەبەر چـــاوم بوون ، لەسەر کەنفاسەکەم دا دەنان .... ئا ئەوە ڕەنگی ســـوّرە ، ئەوەی تر ڕەنگی شـــینە ... بوّچ دوو دڵ بم خوّم لەم کامەرانیە ڕەنگینە بیّبـــەش بکـــەم ؟ بوّچ ئـــەم هەموو زێڕانە نەڕێژمە ناو نیگارەکانم » .**

گوّگانی هونەرمەند ، لـــە ماوەی یەك سالّدا (٤٠) نیگاری نایابی لـــەم دوورگەیە تەواو کرد ، ئەم قوناغەی ، بە بەرزترین قوّناغی بەرهـــەمی ئەم هونەرمەندە دەژمیّردریّ .

بەم جوّرە هونەرمەند باوەڕی بـــە خوّیو هونەرەکەی بەهیّـــز تربوو . بـــەردەوام بوو لـــە قووڵ کردنی تاقیکردنەوە هونەرییەکانی . هەر لـــەم ســـاڵەشـــدا کچێکی نــاو (تیکورا)ی خواســت ، کە خەلکی ئەم بە باشترین نیگارەکانی ئەم قوّناغەی دوورگەیە بوو .

نیگارەکانی گوّگان :ــ ( مـــانگ وزەمین ) ، ( ئافرەتێکی گوڵ لـــــە دەســت ) ، ( چ وەخت دەمخوازیت ) ، دەژمێردرێن .

قوّناغی پڕ لـــە بەرهەم وکامەرانی گوّگان تەمەن کورت بوو ، بەداخەوە ، نەخوّشی وهـــــەژاری وازیان نیّ نەهێنــــا . هونەرمەند سەرلەنوێ گەڕایەوە پاریس ، بیّئەوەی کـــــە هیچ پارەیەکی لە بەرکدابێت . لـــەم کاتە (ئاپسـبیدوّر) ی مامی هونەرمەند کە وەفاتی کردبوو ، میراتێکی باشی بوّ گوّگان بەجێ هێشتبوو . بـــەم پارەیە هونـــــەرمەند پێشانگایەکی تایبەتی بوّ تابلوّکانی خوّی ، لـــە پاریس ، کردەوە .

هونەرمەند بوّ دوا جار دەچێتـــە (کوپنهاگن ) بوّ بینینی ژنەکـــەیو منداڵەکانی ، لـــە پاشان سەرلەنوێ سەفەری ( بریتانی وپوّلدو ) دەکات ، کە لە ڕێگادا لەگەڵ فەرمانبەرەکانی پاپوڕەکـــە بەشـــەڕ دیّ وقاچی هونەرمەند لەم شەڕە دا دەشکێنن .

بەرهەمی هونەرمەند ، هـــەمو کاتێك جێگای دەمەتەقێ بووە ، لەو کاتـــەی کـــە ( شـــارڵ موّریس ) ی ڕەختەگر لە ساڵی ١٨٩٣دا ، بـــەو پـــەڕی ڕێزەوە باسی کردووە . نووسەری فەڕەنسی (ستریندبیرگ) ، کە (دیگـــا)ی هونەرمەند ، برادەری دلسوّزی گوّگان ، داوای لیّ کردووە شـــتێکی بوّ بنووسی ، هیچی بوّ نـــەنوســـیوەو ووتویـــەتی : ــ **« من باوەڕم بـــە فەلسەفەی جوانی واتە ــ ئیستاتیکا ــی گوّگان نیە »** .

گوّگان لــــە پاریس بێزار بوو . سەرلەنوێ سەری هەڵگرت بـــەرەو دوورگـــەی تایتی ... ئەمــــەدوا گەشتی هونەرمەند بوو .. ماڵئاوایی پاریس ... بوّ ئەوەی ئەو چـــەند ساڵەی کە لە ژیانی ماوە بە هەژاری لە هەموو لایەك کرد . لە خێزانەکەی وبرادەران وهونەرمەندان وشـــاری ونەخوّشی وتەنهایی بیباتە ســـەر . بـــە داخەوە هەر ئەم قوّناغـــە دا (نـــالین)ی کچی ، کـــوّچی دوایی کردووە ... ئەم شتە بووە هـــوّی ئـــەوەی کـــە هونەرمەند هەوڵی خوّکووشتنی خـــوّی داوەو تەنانەت بەڕیككەوت ڕزگاری بووە . لـــەم قوّناغە دا لە نێوان ساڵانی ( ١٨٩٦ــ ١٩٠١ ) ، یەك زنجیرە تابلوّی هـــەرە بە رزی ڕەسم کردوون . کە لە پاش مردنیدا ، بە نمـــوونەی هونەری قوتابخـــانەی ئیکسپرسیانیزم ژماردراون ونرخیان گەشیتووەتـــە پارەیەکی خەیاڵی .

هەر لەم قوّناغە دا بووە ڕەنگە کانی هونەرمەند وەکو ئاگریان لیّهاتووە .. ڕەنگە شینەکانبەرەو موّر وڕەنگـــە پەمەییەکان بەرەو ســـوّری ئاگرین ڕوّیشتونو هێزێکی دەروونی پڕ لە لەرینە وەی دەربڕینیان هەڵگرتووە ، بە تایبەتی ئـــەم نیگارە نایابانە :ــ **«ئافرەتێك لـــە ژێر داری مانگو »** و**« داستانەکانی فارفار»** و**«نەخـــێر ، هیچ ئەمـــە نابیّ ! »** و**« لـــە کویّ هاتووین ؟ کیّین ئێمـــــە ؟ بوّ کویّ دەڕوّین ؟ »** .

نەخوّشی وهەژاری ڕوّژ بـــە ڕوّژ کاری خوّیان لە هونەرمەند دەکرد ، ... گوّگان دوا ڕوّژانی ژیانی لـــە دوورگەی ( خیفا ــ ئەوا ) دا ژیـاوە ودوا تابلوّکـــانی ئەمانـــەن ــ **« لـــــەشو ئـــەندامانی زێڕین »** و**« ســـــوارانی ڕوّخ دەریـــــا »** و لە پاشان تابلوّی **«ئافرەتێك لەگەڵ ئەسپێکی سپی »** .

هونەرمەندی مەزن لـــــە ڕوّژی هەشتی مایسی ساڵی ١٩٠٣ دا لـــە دوورگەی ( خیفا ــ ئەوا ) ، کوّچی دوایی کردووە ، لـــــە پاش ئەوەی سامانێکی هەرە بەنرخ ونـــــەمری هونـــەری بـــوّ مروّڤایـــەتی وشارستانیەتی بەجیّهێشتووە .

# سەرچاوەکانی ڕۆ
# نێوان ئەدەب

لایەنەکانی ڕۆشنبیریی .

ڕۆشنبیریی ئادەمیزادیش شتێکە لە ژیانو ، پێداویستەکانیەوە سەرهەڵئەدات . لە هەمان کاتیشدا ئاوێتەکاتە سەر مانەوەو . ژیانی ئادەمیزادیش .

پێداویستەکانی ئادەمیزاد لە سەرەتادا ( ئازەتی ) یە . کە چەتەکەی بڕێتی یە لە ( مانەوە ) . لەبەر ئەمە نارەحەتێکی بەردەوام لە پێناوی بەراستی بوونی خۆیەو ، پێداویستەکانیشیا لە بەخەی ئادەمیزاد نابێتەوە .

هەر لە روو بەروو بوونەوەی ئەم نارەحەتی ، ناتەواوی یە شدا ، ڕۆشنبیریی و ، هونەرو ، ئەدەب دێنەکایەوە

کەواتە ڕۆشنبیریی برخێکی بێسنوری نیە . چونکە هەرچەندە ئادەمیزاد بەحەسێتەوەرو . خۆش گوزەران بێت کەمتر پێویستی بە ڕۆشنبیریی هەیە . لە کاتێکدا ڕۆشنبیریی لە ڕازەی ویستو خواستی ئادەمیزاددایە ، بۆ وەدەست هێنانی ژیانێکی ئاسوودەو بەختیار .

ڕۆشنبیریی لە سەرەتاوە لای ئادەمیزاد لە ناوکی ئەو پرسیارانەوە هاتە ئاراوە ، کە دەربارەی مانەوەو ، سۆگەر کردنی پێداویستەکانی دەری دەبڕین .

لە پێش هەموو شیانەوە سروشتەو ، هێزەکانی سروشت بووە ، واتە یەکەمجار لە پەیوەندی ئادەمیزاد بە سروشتەوە ، سەری هەڵداوە .

ئادەمیزاد ئەو تەنها ئاژەڵە بووە کە شارستانیەتی بە دەست هێناوە . ( ڕۆشنبیریتیش بەشێکە لە شارستانیەت ) چونکە ئادەمیزاد تەنها ئاژەڵێك بووە کە لە سروشت جیادا بۆتەوەو . لە هەمان کاتیشدا لە پێناو پەرژەوەندی خۆیدا لە گەڵیدا کە وتۆتە بەربەرەکانیشەوە .

لەم سەرەتایەوە چەند هۆیەکی ( نیجابی ) و دەروونی کەوتنە جوکە کردنی نێوانی ئادەمیزادو سروشت .

سروشت ئەو دایکە جگەرسۆزەیە کە ئامێزی خەیروخەیراتی بۆ ئادەمیزاد کردۆتەوە ، لە هەمان کاتیشدا ئەو دوژمنەیەتی کە ژیانی دەخاتە مەترسی یەوە .

لەبەر ئەمە هەستی ئادەمیزاد بەرامبەر بە سروشت ئاوێتەیە لە خۆشەویستیو ، ترسو رووبەروو بوونەوە .

کەواتە لێرەدا لەو کارە هونەریانە دەگەین کە سروشت دەشوبهێنن بە دایك .

هەرچەندە سروشت بەرامبەر بە ئادەمیزاد بەخشندەو هێمن بێت ، بەڵام هەر ناتەواوی یەکی تر بەردەوام ئادەمیزاد دەجوولێنێ . ئەویش سروشتی ئادەمیزاد خۆیەتی .

سروشتی ئەو ئادەمیزادەی کە لە دایك دەبێو ، زیادەکاو ، ئنجا پیر دەبێو ، دوایی دەمرێت .

ئەوی ڕاستی بێت ئەم سەرچاوەی ڕۆشنبیریی یەش کە لە ناوەوی ئادەمیزاد خۆیدایەتی ، هەر وەك کێشەی ئادەمیزادو سروشت وایەو ، درێژ بوونەوەی ئەویشە .

لە سەرەتاوە پەیوەندی ئادەمیزاد لەگەڵ ئادەمیزاددا ، وەك تاكو کۆمەڵ جۆرێك بووە لە پەیوەندی ئادەمیزادو سروشت . ئەو کێشەیە دەشوبهایە سەرکێشەی گیانداران لە رووی خواردنو ، خواردنەوەو ، جووت بوونەوە .

ئادەمیزاد بەربەرەکانی ، هێزەکانی سروشتی دەکردو . لە هەمان کاتیشدا کەڵکیشی لێوەردەگرت . لەگەڵ ئەوەشدا دەرکی بەو یاسا شاراوانەش نەدەکرد . کە حوکمی سروشتی دەکرد .

دەشی جووڵاند . هەروەك چۆن دەربارەی مردنو ، سامانیش هیچی نەدەزانی .

لەوە بەدواوە پێویستی ی خۆی بەسەر ئادەمیزاددا سەپاند . کە چارەسەرێکو ڕێگەیەك بۆ ئەم نەزانینەی بدۆزێتەوە . هێندێ جار ( ئەقڵ ) لەم ئاواتەیدا فریای کەوتووە ، زۆر جاریش ( خەیاڵ )

محمد رشید فتاح وەری گێڕاوە

# ...نبیری و پەیوەندی ئایدیۆلۆژی

دەستی داوەتە بالی .

ئەو دوو کێشەیە . کێشـــەی ئادەمیزاد لەگەڵ سروشـــتداو ، هەروەها کێشەشی لەگەڵ خـودی خۆیدا ، وای لێ کردووە کە بکەوێتە بیرکردنەوەو ، تاقی کردنـــەوە . لەگەڵ ئەوەشدا خەیالیـش وای لێ کرد ، کە ئازارو ، خۆشـیو ، ترسو ، ئاواتو ئامانجو ، زانینی خۆی لەم کێشانەدا دەربڕێ .

کەوابێ لێرەوە رۆشنبیریتـی سەری هەڵداوەو ، هاتۆتە نـــاو ناوانەوە .

بە گەشەکردنی ئەم کێشانـەش ئەویـش گەشـەی کـردووەو ، بەرەوپێش هەنگاوی سەرکەوتوانەی ناوە .

لەوە بەدواوەش لەسەرەتـــای دروستبوونی چینە کانی کۆمەڵەوە ، سەرچاوەیەکی تر ، کە سەرچاوەی پـــەیوەندی نێـــوان ئادەمیزادو سروشتی داپۆشی ، هاتە پێشەوە . ئەویش کێشەی چینایەتی بوو .

ئەم کێشـەیە کاتێك هاتە کایەوە ، کـــە ئادەمیزاد کـــەوتە شـــت دروستکردنو ، توانای ئەوەشی تێدا پەیدابوو . کە زیاتـــر لـــە پێویستی خۆی وەدەست بهێنێت .

هێزی بەرهەم هێنـــــان بووە سەرچاوەی ســــامان . ئەوکاتە ئادەمیزاد توانای ئـەوەی یەبوو ، کە جیاوازی لە نێوانی ئەم دوو جۆرە پەیوەندی پەیدا بیکات .

پەیوەندیی لەگەڵ سروشت لـــە لایـــەك ، پەیوەندی کۆمەڵایەتیشی لە لایەکی ترەوە .

لـەبەر ئەمەیە ، لە داستانەکانی ئادەمیزاددا بەئاشکرا ئەوە دەبینین، کە هێزی مرۆڤایەتی تێکەڵ بـــە هێزی سروشت بووە .

کەواتـە رۆشنبیریتـی ســـێ سەرچاوەی هەن :

**١ ــ هەڵسوکەوت لەگەڵ سروشتدا .**
**٢ ــ هەڵسوکەوتی ئادەمیزاد لەگەڵ خودی خۆیدا .**
**٣ ــ کێشەی نێوان چینەکانی کۆمەڵ .**

ئەم باسـەی پێشوومان وامـان لێ دەکات ، کە ئەم سێ سەرچاوەیە وا کورت بکەینەوەو . تەنها پـاڵ پێوەنەرێك بۆ رۆشنبیریتی دابنێین : ئەویش کەڵك وەرگرتنە .

لەمەشەوە دەتوانین بڵێین :

بۆ ئەوەی ئادەمیزاد کەسـانی تر لە پێناوی رازەی خۆیدا بێنێتە گەڕ ، بۆوەش لەدەست چەوساندنەوەو ، ژێردەستەیی قورتاری بێتو ، وە لە پێناوی رازەی خۆشیدا دەست بەسەر سروشتدا بگرێتو ، هەروەها بەربەرەکانی ئەو هۆیانەش لە لەشی خۆیدا بکات ، کـــە بەرەو نەمـــانی دەبەن . لەبـــەر ئەم سێ هۆیـــە ئـــادەمیزاد رۆشنبیریتی خـــۆی بەدەست دێنێت .

لـــە سەرەتـــاوە قـــەدەکانمان وادەرئەکەون کە ( مەنتقی ) بێن . بەڵام تەنهـا کەڵـك وەرگرتنیشـــ رۆشنبیریتی دروست ناکات ، چونکە لایەنێکی گرنگی تریش هەیە ؛ ئەویش لایەنی ( چێـــژ ) وەرگرتنـــە .

هـــەردوو لایەنی کـــەڵك و چێژ وەرگرتن ، پێکەوە گرێ دراونو ، لە یەکتر جودا نابنەوە .

چێژ لە زانستدا هاندەرێکە بـــۆ زانینی زیاتر . ئەوەش راست نییـە کـــە ئادەمیزاد لە چاوی رازەی خودی خۆیدا چێژ دەبینێ . بـــە پێچـــەوانەوە چێـــژ بایەخێکی سەربەخۆی هەیە لەلای ئادەمیزاد .

ئـــەوی راستی‌بێت ئادەمیزادی سەرەتایی ئەو توانایەی نەبووە ؛ کە سنوورێك لە نێوانی کەڵكو چێژ وەرگرتندا دابنێت . کەڵكو چێژ وەرگرتن لە هەردوو جیهانی ( مادە ) و(فکر) دا یەك بنچینەیان هـــەیە . ئەویـــش بەدەســـت هێنانـــی پێداویستەکانی مرۆڤە . کارێـــك هەرچەندە زۆرەملێشی تێدابێت ، لەوا بۆمانەوە پێویستە . ئـــەو گرێکارەی کە قازانجی خۆی، لـــە کارێکی سەختو گراندا مسۆگـەر دەکات ، لەوا لە جێگەیەکی تر بـــە دووی چێژو خۆشـــیی خۆیـــدا مەودال دەدەبێت . ئەو جۆرە هەر جێگەیەك بێت .

با بۆ نموونە لـــە بواری هونەردا ئەمە بڵێین :

( کەسێك لەگەڵ درەختو ، گوڵ چۆلەکەو ، خورەی ئاودا بژی ؛ ئەوا ئـــەو کەســـە لەگـــەڵ جوانی سروشتدا دەژی . ئەمـــەش وای

لێناكات : كە تابلۆیەك ، یا دیمەنێكی سروشت . هەڵبژێرێتەو ، لە بەردەمی خۆیدا دای‌بنێت .

كەواتە دووری ئادەمیزادی هاوچەرخ لە سروشتەوە ، وای لێدەكات كە وێڵی ئەو تابلۆیانە بێت ، كە بە پەرەموو چو . خامەیەك كێشراین ، دەربارەی دیمەنە رازاوەكانی سروشت ، هەر لەمەوە دەتوانین بڵێین : هونەر ( برێتی ) یەكە بۆ پێداویستە كانی ژیان :

جارێكی تریش دەیڵێینەوە : رۆشنبیرێتی لەرێگەی كەڵكو ، چێژ وەرگرتنەوە ، كار دەكاتە سەر ئادمیزاد .

چێژ لە هونەردا زاڵە . بەڵام كەڵك وەرگرتن لە لایەنە كانی تردا خۆی دەنوێنێ .

كتێبێكی سیاسی دەربارەی ( فەلەستین ) زیاتر لە چیرۆكێك دەربارەی فەلەستین كەڵك دەبەخشێت . ئەمەش بە شێوەیەكی گشتی‌وایە ، گەر عەقڵ نزیكترین رێگەبێت بۆ گەیشتن بە كەڵكی رۆشنبیرێتی ، ئەوا چێژ لەرێگەی هەستكردنەوە خۆی دەكات بەناو دەروونندا . لە لایەكی‌ترەوە دەبینین كە ( شێوە ) زیاتر لە رێگەی هەستەوە كاری خۆی كەبینێ نەك لە رێگەی ( عەقل ) ەوە . بە پێچەوانەشەوە ( ناوەرۆك ) لە رێگەی عەقڵەوە كاردەكاتە سەر مرۆڤ ، نەك لە رێگەی هەستەوە .

دەتوانین لەمەوە ئەوە وەدەستبخەین . كە شێوە لە هونەردا لە رێگەی هەستو چێژەوە بەسەر ناوەرۆكدا زاڵ دەبێت . بەڵام لەلایەنەكانی‌تری رۆشنبیرێتی‌دا ئەمە پێچەوانە دەبێتەوە . ئەگەر لە دابڕانی ئادەمیزادی هاوچەرخ بەتایبەتی كەسانێكی چینە چەوساوەكان لە رووی چێژ وەرگرتنەوە ، ورد‌ببینەوەو ، ئەوەش بزانین كە تاكە رێگەی ئاسان بۆ گەیشتن بە ( جەماوەر ) رێگەی ( هەستە ) چونكە ئەمە لەرێگەی ( عەقل ) ئاسانترە . لەكاتێكدا عەقڵ باشترینی هەردوو ئامرازەكەیە بۆ تێگەیشتن .

لەمەوە دەرك بەوە دەكەین ، كە هونەر چ كارێك دەكاتە سەر ئادەمیزادو ، شێوەش لە بواری پەیوەندی‌یەكانی كۆمەڵایەتی‌و . ئابووریدا چ بایەخێكی گرنگی هەیە . لە سروشتدا بەدەمگەن جیاوازی‌یەك لەنێوان شێوەو ناوەرۆكدا بەرچاو دەكەوێت . دەتوانین تەنها بەسەیر كردنێك گەنمو جۆ لە یەكتر جودا بكەینەوە . چونكە شێوە دەلالەت لە ناوەرۆك دەكاتو ، هەموو ناوەرۆكێك شێوەیەكی تایبەتی دەگرێتە خۆی . لەگەڵ ئەوەشدا لە سروشتدا هێندی فێڵو فەرەج هەیە . وەك ئەو جۆرە جۆلەكەیەی كە لەبەردەمی راوكەرێكدا خۆی بە مردوو پیشان دەدات .

فێڵبازترین ئافەریدە ئادەمیزادە . ئەو هونەرمەندانەی سەر بە چینە چەوسێنەردكانن‌و ، بە چەكی هونەرەوە دەچنە مەیانی كێشەی چینایەتی‌یەوە ، لە جیاكردنەوەی شێوە دووی مەبەست دەكەوێت . دەنوێنن .

بەلای ( مادیة ) تەوە مەبەست بنچینەیەو ، شێوەش لقێكە . واتە شێوە دووی مەبەست دەكەوێت . نەك بە پێچەوانەوە .

مەبەستی نوێ پێویستی بە شێوەی نوێ هەیە .

دیارترین رێگەی هەڵخەڵەتاندن ئەوەیە كە ناوەرۆكی كۆن شێوەی نوێی بە بەرابكرێت ، وەك لە شێكی‌ناشیرین لە جلو بەرگێكی جوانیدا .

ئەو گۆرانكاری‌یە گەورانەی كە لە مێژووی نوێدا . بەسەر ئادەمیزاددا هات . شیعری نوێ بە شێوەیەكی نوێی گونجاوەوە خۆی لەرزكرد : چونكە شیعری كۆن ( عەمودی ) توانای بە خۆگرتنی ئەم گۆرانكاری یە نوێیەیان نەبوو :

لە توانادا هەیە كە بیری كۆن لە شێوەی شیعری نوێدا دابرێژرێت ، بەڵام ئەم بیرە كۆنانەش هەرگیز لەم قالبەدا نابنە بیرێكی هاوچەرخانە . بەڵكو تەنها بەشێوە رووی تازەبوونەوەیان پێوە دیار دەبێت .

بەرامبەر بەمەش بیری شۆرشگرانە پێویستی بە بەرگی نوێ هەیە . چونكە بەرگی كۆن بە بەری تەسكەو ، ئازاری دەدات .

رۆشنبیری ئەدیبو هونەرمەند شێوەو ناوەرۆك پێشكەش ناكات ، بەڵكو كەڵكێك یا چێژێك دەبەخشێت . هیچ كارێكی هونەریش بەبێ ناوەرۆكێك مەیسەر نابێت . جا ئەو كارە بۆ رۆشنبیرێتی بێت ، یاخود خۆشی .

بەڵكو جیاوازی‌یەكە لە وەدایە كە شێوە لە پێشترە ، یا ناوەرۆك .

گەر كێشەی چینایەتی نەبوایەو ، چەوساندنەوەش لە كۆمەڵدا بەدی نەكرایە ، ئەوا لەگەڵ هیچ كەسێكدا ململانێی ئەوەمان نەدەكرد . كەشێوە تەنها پێوەرێكە لە رەخنەی هونەری ، یاخود ئەدەبیدا .

له بواری بەربەرەكانی لەگـــەڵ سروشتەو ، خۆشویستنیـــدا ، دەبینین هەموو رۆشنبیرێك بەلای ئادەمیزاددا دای نە شكێنێ . چونكە لەمـــەدا جیـــاوازی نێوانـــی ئادەمیزادێكو، ئادەمیزادێكی ترنیە. باجێگـــەو پایەی چینـــایەتیشی هەرچۆنێك بێت .

لەبەر ئەمە لەواقعدا كۆمەڵ بـــە هەموو چینەكانیەوە روو بەرووی كارەســـاتـــەكانـــی سروشـــت دەوەستنەوە .

گەر لەمەشیاندا كۆكبین یاخـــود ناكۆك . كاتێك باســـی كێشـــەی ئادمیـــزاد دەكەین ، لەگـــەڵ ئەو باسایانەدا كە حومكی بوونو ، مردنی دەكەن . ئەوا لەمەشدا هیـــچ جیاوازییەك بەرچاو ناكەون. مردن چیە ؟. بنچینەی ئادەمیزاد گیانە ، یاخود مادەیە ؟ .. هتد . ئەوەی جیاوازی دەخاتەبەر ئەم زانـــستە بێگوناهەوە ، تەنهـــا جیـــاوازی ئایدۆلۆژییە ، كەئەویش كێشـــەی چینایەتییە .

كەواتە لێرەدا بە روونی گرنگی ناوەڕۆك بۆ رۆشنبیرە ئازادیخـــوا ـ رەكان دەردەكەوێت. هەروەها گرنگی شێوەش بۆ رۆشنبیرە ( محافظە كان بەســـەر ناوەرۆكـــدا ئاشكـــرا دەبێت .

بـــــە گەشەكردنی ئادەمیزاد بۆ دەستەلاتدارو . ژێردەســـتەو . دابەشبوونی كۆمەلكاكـــان بەچەنـــد چینێكەوە . جیاوازی لـــە نێوان كەلكو ، چێژ وەرگرتنداو . هۆشو هەستو ، شێـــوە ناوەرۆكـــدا هاتەكایەوە . هەروەها گۆرانێكیش لە میانەی قیەمی ( مـــادی ) و . قیەمی رۆشنبیرێتیدا روویدا . واتە لە نێوان تەكنیكو ، زانـــستدا . هـــەروەهالە نێوان پیشـــەسازیو هونەریشـــدا .

ئەم گەشەكردنەش بووە هـــۆی

# قوتابخانـــە میللی یەكـــان دەســـتەبەری پێشتربوونی بەرهەم و چاكتربوونی دەبن

ئەوەی كەوا رۆشنبیرەكـــان وەك دەستەیەكی جیاواز لە كۆمەڵ بێتنە ناوناوانەوە .

لە كۆمەڵی فرەچینـــدا خەلكـــی بەرامبەر بە رۆشنبیرێتی بوونـــە دوویەش . بەشێكیـــان بـــووە سەرچاوەو ، بەشەكەی تریشـــیان بووەئاورێژە . بە شە كەمەكەیان كە رۆشنبیرەكانن ئەوا بوونە سەرچاوە. بەشە كەیتریش كە ( جەماوەرە ) بووە ئاورێژ .

رۆشنبیرەكان بەرهەمیان دەدار ، جەماوەریش دەیقۆستەوە . ئەمەش دابـــەش بوونی كـــــــارە . رۆشنبیر كاركەرەو ، جەمـــاوەریش كارتێكراوە .

گیروگرفت لە دووركەوتنـــەوەی رۆشنبیرەكان نیە لە جەمـــاوەر . بەلكو لە وەدایە كە تاچەند نزیـــك ددبنەوە لە چینە دەستدارەكانەوە . رۆشنبیران لە كێشـــەی چینایەتیدا بێ لایەن نەوەستاون . پیویـــستبووە لە سەریان كەجێگەی خۆیان لـــە هەرەمی چینەكانی كۆمەلدا دیـــاری بكەن .

ئەو كۆمەلەی كـــە ئەوانیـــشی ئەندامێكن تیایدا . هەروەها لـــە ســـەریشیان پێویـــستبووە . كـــە لایەنی چینێك بگرن .

ئەم نووسینە كورتـــەی نـــەی لێكولینەوەیەی مامۆســـتا ( بو علي یاســـین )ە كـــەلـــە گـــۆڤاری ( دراسات عربیـــة ) ی ژمـــارە ( ٢ ) ی كانونی یەكـــەمی سالی ١٩٧٧ دا بلاوكراوەتەوە .

وەرگێر

# کوردی و مەریوانی و کتێبی یاری

**غفور میرزا کریم**




**ئاشکراو ڕوونە کە مزگەوت و تەکیەو خانەقاو حوجرەو مەلاو پیاوە ئاینیەکان لە بوارێکی تایبەتی‌دا وە لە پلەو قوناخێکی دیاری کراوا بە مەلبەندی چاو کردنەوەو وریا کردنەوەو سەرچاوەی فێرکردنو ڕۆشنبیری ناسرابوون ، بە مانایەکی تر ئەم لانە زانستی‌یەو ئەم سەرچاوە گرنگەی خوێندن بەر لە دامەزراندنی قوتابخانەو ڕێگا بە شێوەی هاوچەرخ دەورێکی بالاو مەزنی لە پێش خستنی کاروانی ئەسرەوتی گەل‌دا نواندوە .**

بە وێنەی ئەستێرەیەکی پرشنگ دار بوون لە ئاسۆی سەرکەوتن و بەرزی کۆمەڵ دا ، کلاوڕۆژنەیەکی چاو ساغی وریاکردنەوە بوون بۆ ئامانج پێکاندنو گەیشتن بە لووتکەی بەرزی .

نەتی‌ی مزگەوتەکان . **شاگردانو قوتابیانی حوجرەکان لە دەرسی ئاینی‌و هەندێ دەرسی فارسی هەلبژێراو ، گولستان ، بوستان بەولاوە هیچ بابەتە دەرسێکی تریان نەنەخوێندو فێر نەبوون .**

بێ‌گومان پێویستی ڕۆژ بارو دۆخی دوا کەوتنی ئەو سەردەمە لەمە زیاتری بە بالای کۆمەلگای کوردا نەبڕی بوو . واتە هێشتا دەرسی نوێی فێر بوونی بابەتی هاوچەرخ و گونجاو لەگەڵ پلەو قۆناخی تازەدا نەکەوتبووە ناو ناوانەوە . ویستی ڕۆژو خواستی مێژو هیچی تازەی نەهاوێشتبوە ناو لیستەی خوێندن و فێرکردنەوە بۆیەکا لەو سەردەمەدا (یاری)

وەکو دەرسێ لە دەرسە تازەکانی هاوچەرخ نەهاتووە ریزو ناوی پەیدا نەکردبوو .

نەقێو شاگردانی حوجردو تێکڕا کۆمـــــەلانی خەلك بە ئازادی‌و بە ئارەزووی تایبەتی ، بە هەوەس‌و خۆشی دڵ هــــەر چەشنە یاری‌یەکیان بوبستایە لەو یاری‌یانەی کە لە ئارادا هەبوون ئەیان کرد . لە نێوان خۆیاندا بە شێوەی گەڕەك گەڕەك یان هـــاو پیشەیی ڕێك ئەکەوتن قـــەیان ئەکرد بە یەك لەم دەشت یا لەو سەر کرد یا لەو گوێ کانی بە یاری کـــردن ماوەیەکیان ئەبردە سەر ؛ تۆزی پەژادەو دڵ پەستی دەروونیـــان ئەدا بە دەم باوە ، کەمێك دەماری کرژبووی لـــەشیان خاو ئەکردەوە ، بایەکیان بە باڵی خۆیان ئەدا ، بەمـــە بناغەی لەشی ساغی‌و تەندروستی خۆیان دابین ئەکرد . هەست‌و هۆشیان جۆشی ئەخوارد .. کە لایان وابوو بەم کارە پێویستی یا ئەرکێکی سەر شانیان جێ بە جێ کردووە .. ئەمە سەرەڕای ئەوە کە سروشتی ڕەنگاو ڕەنگی کوردستان ، جوانی‌و دلگیری بەهارو وەرزەکانی تر کە لە جیاتی دڵێ هەزار دڵی بۆ حــــەیران ئەبێ . خەلکی ئـــەو ڕۆژانەی ئەهاویشتە ناو بـــەهەشتی هەمیشەییەوە ، هەوەس‌و ئارەزووی یاری ؛ گۆرانی ، هەلپەڕکێی تیا ئەهاژاند . تا هاوبەشی لە خۆشی‌و جوانی‌ی سروشتدا بکەن .

**پیرە مێرد وێنەگری ڕاستی‌و گەریدەو شارەزای هەلکەوتووی ئەم ولاتە هەرچەندە لە زوور باسی داسلیمانی ئەهێنێتەوە بە نمونە بەلام یە بـــە ڕ؟ هەرچی‌دەلیت سەرتابای‌ولات ئەگرێتــــــەوە کــــورد وەتەنـــی مشـــتی نمـــونەی‌ـــــ خــــەرواریکە . لێرەدا پیرە مێرد باسی ئـــەو سەردەمەمان بۆ ئەکات کە هێشــــتا یاری تازە بابەتی هاوچەرخ وەکو فوتبۆڵ ، تێنس .. هتد نەهاتبووە کایەوە هەرچی هەبوو تەنها یاری‌یــە میللیەکانی خۆمان بوو‌ەو .. هەروەها ئەلێت :**

سالانی پێشوو ، کاتی بەهار لە هـــەر چوار لای شارەوە ، گەڕەك ، گەڕەك بە دەســــــتە کوڕان تێواران ئەچوونە قەراغ شار بۆ یاری کردن . لـــە کانیسکان . لـــە دەشتی کۆلك ، لە بەر گردی فەقێیان دا یاریان ئەکرد ، کە یارییەکانیش ئەمانە بوون . شـــەڕە تۆپ . کەوشـــەك ؛ سێ باز ، بوخچە بە گەردانی ؛ کـــلاو فرکێنی ، ئاشە بە تەندورە ؛ قەلە مرداری ؛ قەلا ، قەلا گوریس کیشەکی .

**بەلام بەهـــاتنی دەمو دەزگای نوێ ، کردنەوەی قوتابخانەی هاوچەرخ یاری وەکو دەرسێك کەوتە ناو لیستەی دەرسەکانی ترەوەو ئەخوێندرا .. قوتابیـــان لێ‌پرسیار بون بەرامبەر فێربوون و تاقی کردنەوەی .**

دەســــــتەی کوردی‌و مــــەریوانی کــە بە پێی پێویستی مێژووی ڕۆژگاری ئەو چــــــەرخە هاتبونە کۆڕی جموجولی خـــەباتەوە بەرامبـــــەر بارو دۆخی ناتۆلای ئەو ڕۆژە تولنگی فەرهـــادی ڕۆشنبیریان ڕا ئەوەشاند ، بە وێنەی کاوەی ئاسنگەر ئەرك‌و فەرمانی زانســتی‌و بلاوکردنەوەی خوێنـــــــدەواریان خستبوە ئەستۆی خۆیان لەو هەڵ‌و مەرجە کووڕو ناهەموارەدا چی‌یان لە تواناد‌ا بو کردیان هیــــچ نەبێ بـــــەردێکی بچووکیان نایە ناو بارو بارخانەی ووریایی پێشکەوتنی گەل وە ئەونەمامێکیان لە باخچەی نیشتماندا ناشت .

هیچ گومانی تیا نی‌یە ئەم دەستەیە لە مەیدانێکی پان‌و بەرین‌و فراواندا وەك چاپووك سوارێکی بـــــە توانا ئەسپی خـــۆیان تاو ئەدا بە هــــەر چواردەوریاندا کەوتبونە جوولە دەستەو یەخە دژی ئەخوێندەواری ، دواکەوتن . داماوی وەستابوون ، بۆ داڕشتنی قالبی نوێی پێشکەوتن ، دروست کردنی وشـــەی دلسۆزو جوانی کورد شەوگاری ناڕەحەتیان گرتبوە بەر لـــــە کوێوە بۆنی بۆ کرووزی دواکەوتن‌و هەناسە ســـاردی بهاتایە یان چاویان بە کەلاوە کۆنەیەکی کلولێ بکەوتایە یان پێیان هـــەلنوتایە بــــە کەنـــدو کۆسپی گیرمەو کێشەی زانستی‌دا وەك شێر ڕانەچلەکین‌و ئەهاتنـــــە کۆڕی خەباتەوە . بە چەکوشی بیرو مێتنك بە هەوڵ‌و کۆششی ســەختی بـــــەردەوام دەرگای پێشــــکەتن‌و زانستی‌یان ئـــــەکردەوە . هەوری بەدبەختیان لـــــە ئاسمانی گەورەی پێشکەوتنی کوردا ئەڕەواندەوە بـــە ڕاستی ئەرکی ئەو ڕۆژەی شۆڕە سوارانی ڕۆشنبیری کورد بریتی بو لە هانەهان دانی لاوان بۆ خوێندن ، بۆ زۆر کردنی قوتابخانە . بۆ پـــاراستنی زمانی کوردی‌و دەولەمەند کردنی بـــــە وشەی تازەو بلاو کردنەوەی زانـــستی بەلکو لەم سووچەوە بتوانن پالێ بنێن بـــــە کاروانی ئەسرەوتی خەباتی کوردەوەو شتێ بـــە شتێ بکەن .

**جا لـــەبەر ئەوەی کە لە قوتابخانەکاندا دەرسی یاری وەرزش کەوتبوە ناوانەوە وە بایەخی پێ ئەدرا ، لاوانو قوتابیان ســــەریان کردبوە سەری ڕۆشنبیرانی کورد بە پێویستی سەرشانیان زانی کە لەم مەیدانەدا بەشداری بکەن‌و سوودو کەلکێ بگەیێنن بەبە کەلکەلەی گوورینی ئەم یاریە تازە داهاتوانەیان بۆ زمـــانی**

**کوردی کەوتە سەر تا لـەم بۆچوونەوە**
**بتـــوانن هانە هانەی کۆمەڵانی خەڵك**
**بدەن بۆ یاری کـردن ، پـــەرەپێدانی**
**گیانی وەرزشی ، تا نەوەیەکی لـــەش**
**ساغی مێشك پاکی دڵ خـــاوێنی باش**
**پەروەردە کەن لەم نیشتمانە دا .**

لەبەر ئـەم هۆیە ئەم نامیلکە خخیـــلانە ( ٣١ ) لاپەڕەییەیان بە ناوی ( یاری ) وە دانا کە بێ گومان بە سەنگو بەردی ئەو ڕۆژە جێگایــــەکی دیاری کراو وەرئەگرێو کەلێنێکی گەورە پڕ ئەکاتەوە لەکەلەپووری میللیو شوێنەوارێکی گرنگو بەنرخ بەجێ ئەهێڵێ لە مێژووی زانیستیو وریایی ڕۆشنبیرانی کورد دا .

**پێشکەشی نامیلکەکە ئەم دێڕەیە :**

ئەم کتێبە بچکۆلەیە زۆر بەکارە ئەکەین بـــە پێشکەشی هەموو قوتابییەکی گورجو چالاکی کورد .

**بەڕاستی ئەم پێشەکیە هەرچەندە چــــەند ووشـــەیەکی ڕیزکراوەو بوە بــــە دێڕێك ، ملوانکەیەك ، بەڵام لـەو ڕۆژەدا زۆر گرنگو پڕ مانا بوو بە تایبەتی ئەم نامیلکەیە پاش ڕاپەڕینی شەشی ڕەشی ئەیلولی ١٩٣٠ دەرچووە کـــە قوتابیانی کورد یەکەم جارە بـــە سنگی ڕووت دێنە مەیدانی خەباتەوە ، ئەبنە پێشەنگی گـەلی چەوساوە بۆ مافی ڕەوای خۆیو بــــە هەموو مانایـــەك دەوری بـــاڵای خـــۆیان نوانـــدو ڕاپەڕینەکەی بەر دەرگای ســـەرایان لە مێژووی کوردا بەخوێنو ئازایەتی نووسی .**

دیارە پێشکەش کـــردنی ئەم نامیلکـــەیە بۆ قوتابیـــان جێگای شانازیو مـــانای یادکردنەوەی دەوربانە لەو ڕاپەڕینەدا لە وەختێکدا کـــە دامودەزگای کۆنی ڕابردوو هەر خەریکی ئەوە بوو پەردە بە ســەر ئەو ڕۆژە پیرۆزەدا بداو دیزە بـــەدەر خوونەی بکا . بەڕاستی پەنجە درێژ کردن بۆ قوتابیان ، ناوهێنانیان، مانای دان نانە بە زانیستیو خوێندەواریو نرخ دانـە بە هێزێکی تازە کورەی خوێن گەرمی چاو نەترس کـە توانیان لە مێژووی تێکۆشانی گەلی عێراقدا دەورێکی گـــەورە بگێڕن لە خۆبەخت کردنو قوربانی دانا بۆ بەختیـــاری گـــەلو ڕزگـــاری وولات لـــە چنگ ئیمپریالیزمو دامودەزگای .

**پاشان دێتە سەر سەرەتاو ئەڵێت :**

١ ) لەســــەر گەلێ تکلیفی هەندێ مامۆستای ناسیاو ئەم کتێبە بچووکەمان پێك هێنا هیوامان هەیە بۆ قوتابخانەکانی کوردستان زۆر بەکەڵك بێت چونك ئەمە تا ئێستا نەکراوەو زۆریش پێویستە .

٢ ) لەبەر ئەوەی نەحتی پەلەی تیا کـــــراوە ئەوەڵ جاریشە زۆر کورتمان کرد . تکا ئەکەین ئەگە ناتەواوییەکیشی تیا بینرا بمان بەخشن .

**٣ ) سپاسی ئاشکرا بۆ مامۆستای قوتابخانەی ئەوەلی سلیمانی شاکر سید حکیم ئەفندی کـە لـــ نووسینەوەی ئەم کتێبەدا زۆر یارمەتی دابن .**

٤ ) ئێمە کە دەستمان دایە ئەم ئیشـە هیـــوای یارمەتی خێرخواهانی میلەت بووین بە ڕەواج دان بەم کتێبانە بە فرۆستنیو کڕینی کەچی لەوانەی کە خۆیان بە ڕەهبەری قەومەکەمان ئەزانن کتێبیان لــێ داوا کردین کـــــە بۆمان بفروشن ، کەچی فرۆشتیان وە چاویان لە پارەکــە پۆشی .

**کوردیو مەریوانی**

ئەگەر بێتو بڕوانینە ئەم سەرەتایەو شیبکینەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە خزمەت کردنی قوتابیان بــە گشتی . فێرکردنو ، چاو کردنەوەو ڕاپەڕینیـــان ، باڵ پێوە نەرو هاندەریان بووە لە هەڵگرتنی ئــەم ئەرکەو جێ بەجێ کردنی ئەم ئەرمانە . پیرۆزەدا . ئەوسا دێتە سەر ستایش کە بۆ نموونە مامۆستـــا شاکر دێنێتەوە هەر چەندە کە زۆر کەســـی تـــر یارمەتی داوونو پشتی گرتوون ، چونکـــە کوردیو مەریوانی وەکو وتمان گەرچی دووکەس بوون بـــەڵام بەناوی دەستەیەکەو لە ڕۆشنبیرانی کورد خامەیـــان هەڵنەسووڕان وە ڕێگای خەباتیان گرتبوە بــــەر . لە دووایدا ئەکەوێتە توانج گرتن لەوانەی کـــە تـا دوێنێ بوو لافو گەزافی کوردایەتیان لێ ئـــەدا سەری هەزارانیان ئەبڕی کەچـــی ئـــەمڕۆ پارەی کتێبەکانمان ئەخۆن . دیارە کوردیو مەریوانـــی نەیانتوانیوە لەمە زیاتر بلێن ، دیارە مەبەستیـــان لەوانەیە کە لە پاش ڕاپەڕینەکەی بەر دەرگای سەرا پشتیان کـــردە گەل خۆیان خـــستە ناو باوەشی نازو نیعمەتەوە ، پیرەمێرد لە هەڵبەستە بە ناو بانگە کەیدا ئەمانە باش ئەشوا کە ئە ڵێت :

**وەفـدی کوردستان میللەت فرۆشان**
**هەرزە وەکیلی شـاری خامۆشـــان**
**چەپکێ گوڵەکەی باخەکەی ســـەرا**
**بیبەنــە خزمەت عەرشــی عێراقـــی**
**بلێن یار باقی هـەم سحبـەت باقی**

پاش ئەمە دێتە سەر یاریەکان . یاری سوێدی کە تازە هاتبوە ناوناوانەوە ، ماوەیەك خۆیان پێوەخەریك کرد تاخستیانە شێوەیەکی کوردیەوە و پێشکەشی قوتابیانی ئەو ڕۆژیان‌کرد بۆ وێنە وا نموونە یەکی لێ ئەخەینە پێش چاو :

**گرد بە**
**بە بالا ڕیزبە**
**ڕاحت ـ کە**
**وریا ـ بە**
**لەسەر ڕاست ڕێك بە**
**بۆپێش بڕوانە**
**لە ڕاستەوە بژمێرە**
**وریا ـ بە**
**زوباژنە ـ هەلبڕە**
**پاژنە ـ دانێ**
**هێواش پاژنە ـ هەلبڕە**
**پاژنە دانێ**
**بۆکەمەر دەست**
**پاژنە هەلبڕە**          **دوو جار**
**پاژنە دانێ**
**٢ سێ جار تەنەفوس کە**
**بۆخوارەوە دەست**
**ڕاحت‌ـکە**
**وریا ـ بە**

بەم جەشنە یاری ئەو سەردەمەی قوتابخانەکانیان کرد بەکوردی جگە لەوەی کە مامۆستاکانیش هیچ دریغیان لەوەدا نەکرد کە بەم شێوە کوردی بە مەشقیان بەقو تابییەکان ئەکردکە تا ئەمرۆش شوێنەواری ئەو عەولو کۆششە هەر دیارە . بەراستی ڕۆشنبیرانی کورد لەم جموجولەیاندا کەلکیان لەو دەرفەتە وەرگرتبو کە قانونی ژمارە (٧٤) سالی ١٩٢١ دابوی ؛ ئەو قانوونەی کە لەژێر پالە پەستۆی جوولانەوی کورددا دامودەزگای دوابراوی دەوری پاشایەتی دەری کردبوو کە بە پێی ئەم قانوونە پیویستە لە قوتابخانەو دادگاو جێگاکانی ترلە ناوچە کوردەکان‌دا بە کوردی بخوێنرێت و قسە بکرێ . دوایی دێتە سەر باسی یاری تازە داهاتووی بێگانە ، یاریە میللیەکانی خۆمان باسی فوتبۆلێن ئەکار کە ناوی بە تۆپی پی ناوئەبا . وە ئەگەرێتەوە سەر باس کردنیو ئەلێت :

ئەم یاری یە لە دوو دەستەی (١١) کەسی پێك دێ لە گەل حەکمێكو بۆهەمو ئەندامێك ناوێکی

کوردی داتاشیوە . هێرش کەر یانی مهاجم . قەلایانی گۆل ، قەلا پارێزیانی گۆلچی ... هتد . پاشان دێتە سەر باسی یاری تەنس کە بەد رێزی لەمەنس لە دوێ پاشان دێتە سەر باسی یاریە میللیەکانی خۆمان .. وەکو قەلە مرداری ، بوخچە بە گەردێ .. لەمەش مەبەست ئەوەیە کە پێویستە قوتابیانو لاوان لەگەل فێربوونی یاری تازە داهاتوودا نابێ یاریە کۆنەکانی خۆمانیان لەبیر بچێتەوەو فەرامۆشی بکەن ، بەلکو پێویستە کەلك و سوود لە هەردوولا وەرگرن ، تائەوە یەکی لەش ساغی چاوکراوی گورجوگۆلی نیشتمان پەروەر پێتەکایەوە و پەروەردە بکرێ .

پاشان دێتەسەر کە شافەو پێویستی یەکانی ئەوانەی ئەبن بە کە شافەو یاسای کە شافە بە دورو درێژی لەم باسەش ئەدروی ونەرك فەرمانی قوتابیەکانی بەرامبەر بەم کارە دەرئەخا . هانەهانەی لاوان ئەدا تا ببنە .

کەشافەکەریکی خاوەن شەرەفو دلسۆز ، تاسوودیان‌بو گەل ببێت وە بنەمایەی شانازی وە بەرزی بۆ نیشتمانەکەیان .

**.. بەمە دووایی بە نامیلکەکەدێ ..**

# فلیمی سینەمایی

# گوڵی خوێناوی

عمر علي امين

١ ـ **فیلمەکـە** : ڕەنگاو ڕەنگە

٢ ـ **ماوەکـەی** : دەوری پەنجا دەقیقە دەخاێنێت .

٣ ـ **جێگاکـەی** : کوردستانە

٤ ـ **جلوبەرگ** : کوردی‌یە . بەڵام جل و بەرگـی پاشاو ، پاشاژنو ، پاساولـەکان هیچ سەردەمو . دەولـەت و ، پاشایەك ، دەستنیشان ناکات.

٥ ـ **هەلپەڕکێکە** : کوردی‌یە .

٦ ـ وام بەڵام پەسەندترە لەجیـاتی ئـاوازە کۆنەکەی : ئاوازی سـوێی کـوردی بـۆ گۆرانی‌یەکانی ، دابنرێت .

٧ ـ دووا گۆرانی کوڕە . هۆنراوەی سینـاریـو نووسە :

ئەو دڵەی من . کە بۆ تۆ دروست کراوە
نادۆڕێت و ، نەدۆڕاوە
گوللەی پاشا . کار ناکاتە سەر ئەوی دڵەی
کە خۆشەویستی لیا ڕوواوە
خۆشەویستم ! شایسنەی گوڵی گەشاوە
ئاواتەکەت : هەردێتە دی و بە سەر و پێچی ڕازاوە
لە شاییدا ، بەیەکەوە هەڵدەپەڕین
بە گوڵی ئاڵ و زەردی باخچەی پاشاوە .

٨ ـ **ڕابەری نیشانەی وێنەکان .**

ـ ز . گ : واتە وێنەیەکی زۆر گەورە : V. C. S

ـ گ : واتە وێنەیەکی گەورە : C. S

ـ گ . پ: واتە وێنەیەکی گەورە هەتا پشتێن : M. C. S

ـ ن : واتە وێنەیەکی ناونجی : M. S

ـ ن.د : واتە وێنەیەکی ناونجی دوور : M. L. S

ـ گش : واتە وێنەیەکی گشتیی : L. S

ـ گش . د : واتە وێنەیەکی گشتیی دوور : D. S

٩ ـ مافی بەرهەم هێنانی ئەم سیناریۆ یە : هـی سیناریۆ نووسە .

**سیناریۆ نووس : عومەر عەلی ئەمین .**

١

به دەم مۆسیقایەکی دلگەرەوەوە

| | |
|---|---|
| ١ ـ گش . د | **چەند ئاسۆیەکی دووری چەند زنجیرە شاخێکی جوان .** |
| ٢ ـ گش | **زنجـیرە شاخێك بە لوتکـە بەرزەکانیەوە .** |
| ٣ ـ ن . د | **ڕووەو کامێرا ، لا پاڵێکی بەردەڵانی شاخێك .** |
| ٤ ـ ن . د | **تەنشتەو کامێرا ، لا پاڵێکـی پـڕ داربەڕووی شاخێك .** |
| ٥ ـ ن . د | **مەلی ڕەنگاو ڕەنگی کێوی بەسـەر بەردەکانەوە .** |

٦ ـ ن . د — ژێرەو کامێرا ، دۆلێکی قوول ئـــاو بەناویا دەڕوات .

٧ ـ ن . د — سەرەو کامێرا ، دارستانێکی چـڕی داربەڕووی بەرزی ناو قەد ئەستوور .

٨ ـ ن . د — بۆلێك کـــەو بە شینکە یەکـەوە دەخوێنن .

٩ ـ ن . د — قەلبەزەکانی ئاوی چەمێك .

١٠ ـ گش — تاڤگە یەلو .

١١ ـ ن . د — سەرەو کامێرا ، تاڤگەیەك .

١٢ ـ گ — ڕووەو کامێرا ، ئاوەرێژەی تاڤگـە یەك .

١٣ ـ ن . د — فڕینی مەلی ڕەنگاو ڕەنگـــی کێـوی لە چلێکەوە بۆ چلێکی کە .

١٤ ـ ن . د — پشتەو کامێرا . شوانێك لەســـەر بەردێك دانیشتـــووە شمشـــاڵ لێ ئەدات، دوو سەگ لەلایەوە بەدیار ڕانێکی مەڕو بزنەوە کـە لە پووشی لا پالێکدا دەلەوەڕێت .

١٥ ـ ن . د — ڕووەو کامێرا ، شوان و سەگەکان.

١٦ ـ گ — سەرو کەللەی مەڕو بزنەکان لەکاتی لـەوەڕدا [ دەگۆڕێت بـە ـ گش ] ڕانەکە دەلەوەڕێت و شوان و سەگ بە دیاریەوە .

١٧ ـ گش — ڕەوەیەك ماین و ئەسپ لەکاتـــی لەوەڕدا لەگوێ ئاوێك [ بەرە بەرە ، دەگۆڕێت بۆ ـ ن.د ]

## ٢

## بـــەدەم دەنگی نزمی دەهـــۆڵو زوڕنایەکەوە لەســـەر ئاوازی هەلپەڕکێیەکی کوردی

١ ـ ن — سەرەو کامێرا . سەرە لوتکـــەی شاخێکی بەرز [ کامێرا بەلا پالەکەیدا دێتە خوارەوە بۆ بنار شاخەکـــە [ دەگۆڕێت بە ـ ن.د ]

٢ ـ ن . د — لەنشتەو کامێرا ، هەر هەمان بنار شاخە ، چەند باخێکی قەراغ دێیەك دەردەکەوێت کە درەختەکانی بەهۆی وەرزی پایزەوە . ئاخـر گەلاڕێزان دەکەن .

٣ ـ ن . د — چەند گەلایەکی زەرد دەوەرێنـــە خوارەوە بۆ ناو کانییـــەکی ڕوونی گەش ؛ کە ئاوەکەی لەبەر دەڕوات بە جۆگەیەکدا .

٤ ـ — کۆمەلێك قازو مراوی لە جۆگەکەدا مەلە دەکەن .

٥ ـ ن . د — بەدەم ڕۆیشتنی کامێراوە لەگـــەڵ جۆگە ئاوەکەو . درەختـــەکانی قەراغیدا ؛ ( دەنگـــی خوێندنـی کەلەشێر و حیلەی ماین و ، دەنگی مانگا و گوێرەکە و . مەڕ و بـزن ؛ ئاوبەناوێك تێکـەڵ بە دەنگی ئاوازی دەهۆڵ و زوڕناکە دەبێت ، ( بەدەم

٦ ـ — نزیك بوونەوەی دەنگی دەهـــۆڵ و زوڕناکەوە . بەرە بەرە خانوەکانـــی قەراغ دێ یەکە .

٧ ـ گش — دێیەکە هەمووی .

## ٣

١ ـ گ — کەمێك پشتەو کامێرا ( بەدەم بـەرز بوونـــەوەی دەنگـــی دەهـــۆڵ و زوڕناکەوە ) گوپی خڕی زوڕنا ژەن کە پڕێتی لە فوو ، زوڕنایەکی بـــە دەمەوەیە پەنجەکانی دەستی لەسەر کونەکانی زوڕناکە یاری دەکات .

٢ ـ گ — ڕووی دەهۆلە کە و هەلس و کەوتی داری لێدانە کەی لەسەری [ دووبارە بوونەوەی وێنەی ( ١ ـ گ ) لەگەڵ ئیقاعی ئاوازکە دا دووبارە بوونەوەی وێنەی ( ٢ ـ گ ) لەگـــەڵ ئیقاعی ئاوازەکە دا ] [ ئەم دووبارە بوونەوانە بۆ ماوەی چەند جارێك ]

٣ ـ گ — ڕووی دەهۆلە کەو هەلس و کەوتی داری لێدانە کەی لەسەری پشـتە و کامێرا ، [ دەگۆڕێت بە ـ گ . پ ] کە دەهۆڵ ژەن و زوڕنا ژەن پشتەو کامێرا هەردووکیان دەردەکەون .

٤ ـ گ — ڕووەو کامێرا ، ڕوخساری چـــۆپی کێشەکان یەکە یەکە بەرێز لـــە هەلبەڕکێیەکی ڕەشبەلەکی بـــە جۆشدا . بـە جوانترین جلو بەرگی

کوردیەوە . بەرە بەرە [ دەگۆڕێت بە ـ ك . پ ] .

٥ ـ ك هەیاسەی ژنان بە پلپلەوە . پشتێنی پیاوان بە خەنجەرەوە کە هێندێکیان تەزبیحیان ئالاندوە لە مشتوەکانیان ، یەکە یەکە بەڕێز . [ دەگۆڕێت بە ـ ن . د ] .

٦ ـ ن . د هەڵپەڕکێ کە هەمووی .

٧ ـ سەرچۆپی کێش ، کە پیاوێکە .

٨ ـ ن . د ڕووە و کامێرا ، قاچی چۆپی کێشەکان .

٩ ـ ك . پ پشتە و کامێرا ، هەڵپەڕکێ کە .

١٠ ـ ن . د تەنشتە و کامێرا ، هەڵپەڕکێ کە .

١١ ـ سەر سەربانەکان . بەرە بەرە تەماشاکەرانی ناو گۆڕەپانەکەو [ بەدەم نزم بوونەوەی دەنگی دەهۆڵ و زوڕناکەوە ] [ دەگۆڕێت بۆ ـ گش . د ]

٤

**وێنەی ژمارە (١١) ی بینراوی (٣) کە وێنەیەکی گشتی دووری شایەکەیە ، دەبێتە باك گراوندێك بۆ ئەم بینراوی (٤) ،**

( دەنگی دەهۆڵ و زوڕناکە بەنزمی دەبیسترێت )

١ ـ ن . د لە تەرافێکی کەی دێیەکەدا کۆمەڵە تاوێرێکی بەردی گەورە و بچووك و بەرز و نزم بە یەکدا چوون ، لەسەر کانی یەك ، لەناو باخێکی دار و درەخت ڕوولدا کە تاك و تەرا گەڵا بە لقەکانیانەوە ماوە .

٢ ـ ژێر درەختەکان گەڵای زەردی لێ ڕژاوە .

٣ ـ تەنشتە و کامێرا کوڕێکی گەنج بە پەستییەوە خۆی خەریك کردووە بەجلێ درەختێکەوە [ بەرە بەرە دەگۆڕێت بە ـ ك . پ ] کە بە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە چاوی بڕیوەتە ڕووەو کچە .

٤ ـ ك ڕووە و کامێرا ، ڕوخساری کچێك کە خەم و پەژارەی لێ ئەتکێت [ دەگۆڕێت بە ـ ن . د ] کە کچە بەسەر بەردێکەوە دانیشتووە .

٥ ـ ن . د تەنشتە و کامێرا ، کوڕە دەست لە لقەکە بەردەدات و بە دەم سەیر کردنی کچەوە ڕووەو لای ئەو دەڕوات ، لای کانی بن بەردەکانەوە ڕادەوەستێت و پێی ئەڵێت
ـ نازدارەکەم ! تاقانە ئەستێرە پرشنگدارەکەی کاروانی ڕێگەی ژیانم ! هەتا کەی جڵەوی خەم و پەژارە بۆ دڵت شل ئەکەیت ؟ هەتا کەی ئەم تەمی پەستی یە لەو ڕوخسارە جوانەت نارِڕێنیتەوە ؟

٦ ـ کچ بە پەستی یەوە دێتە خوارەوە پاڵ ئەدات بە درەختێکی لای کانی یەکەی نزیك کوڕەوە ، پشتی سەری ئەنێت بە درەختەکەوەو ڕووەو کامێرا ، وەك سەیری ئاسۆیەکی دوور بکات [ دەگۆڕێت بە ـ ك . پ ] لەبەر خۆیەوە :

٧ ـ ك . پ ـ خۆشەویستەکەم . . زۆر جار پێم وتویت ، هەتا ئەو کاتەی کە لەگەڵ ئاواتی دڵما دەست ئەکەینە ملی یەکتری و بە یەکتر شاد ئەبین .

٨ ـ ن ڕووەو کامێرا ، کوڕە لێی نزیك دەبێتە وە کە لەم کاتە دا کچە پشتەو کامێرایە :

ـ تاقانە خۆشەویستەکەم ! ئاواتی دڵی هەردووکمان هەر یەك ئاواتە . . گوڵی ژاکاوی باخچەی ژیانی منیش تەنیا بە تیشکی زەردەخەنەی ئەو دەم و لێوەی تۆ ئەگەشێتەوە . . .

کێ دیویەتی گوڵە بەڕۆژە لە تیشکی خۆر بتۆرێت ؟ . . . دەفەرمو با بەیەکەوە بڕۆین بە بلێسەی خۆشەویستیمان وەك و خەڵك ڕۆژانی [illegible]مان بە خۆشی و شادی و هەڵپەڕکێ ڕووناك بکەینەوە

( ئیشارەتی شـــایەکەی بۆ دەکات ) فەرمو سەیرکە .. ئەها..
بڕوانە ( بـــە دەم بە دەورووشت هاتنیا ) بە گۆرانییەوە :

**- بڕوانە شایە چۆپیە لەومالە**

**گوێ بگرە زوڕنایە دەهۆڵە شمشالە**

[دەگۆڕێت بە - ن.د ] گۆرانییەکە بەردەوامە

٩ - ن . د **زەردو سوور تێکەڵ بوون ژن و پیاو هەرایە**
**لەو ناوە هەر هاوڕێ هەیاسەی تۆ نایە**

٥

هـــاڕەی هەیاسە لەگـــەڵ دەنگی شمشاڵدا لەسەر ئیقاعی مۆسیقای گۆرانی یەکە

١ - ن ڕووەو کامێرا ، هەیاسەی چـــەند ژنێکی چـــۆپی کێش لـــە نـــاو ڕەشبەڵەکە کـــەدا لـــە کـــاتی هەڵپەڕکێ دا

٢ - ئەنشـــتە و کامێرا ، شمشاڵ ژەن بە شمشاڵ لێدانەوە لەسەر ئاوازی هەڵپەڕکێ کە .. [ دەگۆڕێت بە - ن . د ]

٦

١ - گ . پ ئەنشتە و کامێرا ، کوڕ لە گۆرانییەکەدا بەردەوامە :
**- ســـا توخوا خێراکـــە بابڕۆین دەست بگرین**
**بەکامی دڵداری پێکـەوە هەڵپەڕین**

٢ - ڕووەو کامێرا ، کچ بـــە گۆرانییەوە لە کوڕە دەچێتە
**پێشـــەوە ، کە لەم لاتەدا کـــوڕە پشتەو کامێرایە :**
**- گوڵ نەبی بۆ سەرم ئاڵ چـــەپکی زەرد چەپکی**
**نایەم بۆ زەماوەند نایەم بۆ هەڵپەڕکێ**

٣ - ن ئەنشـــتە و کامێـرا ، کـوڕ بـــە گۆرانییەوە :
**- کچ لە ڕێی جوانیتا کچ لـــە ڕێی جوانیتا**
**- کچ لە ڕێی نیو نیگای هاتوو چۆی کانیتا**

٤ - ن . د ( لەگـــەڵ دەنگی گۆرانی کوڕەدا ) دارو درەختی باخـــەکـــە بـــە ڕووتاوەیی :

٥ - گ چەند لقێکی ڕووتاوە کە تاک و تەرا گەڵای پێوە ماوە .

٦ - ن . د ژێر درەختەکان گەڵایان لێ ڕژاوە . دەنگی گۆرانی کوڕە :

**- پایزە گەڵای دار ڕژاوە باخ ڕووتە**
**گوڵ تواوە ، گـوڵ ئێوی بژەنـــە پشکوتە**

٧ - ن . د لەگەڵ کۆتایی ئەم بەشەی گـۆرانی یە کەدا بەرە بەرە کوڕە و کچە .

٧

١ - گش بەدەم مۆسیقای گۆرانی یە کـەوە ، پشتە و کامێرا لـــە نێوان کوڕە و کچەوە ، دوو لاو ، هەر یەکـــەیان ئەنشتە و کامێـــرا دەستی کچێکی گرتووە کە خۆیان ڕازاندۆتەوە ، بـــە باز بازێن و قریوە قریوو پێکەنینەوە، بە لایاندا بەرەو شایەکە دەڕۆن . کورەو کچە سەیریان دەکەن هـــەتا دوور دەکەونەوە .

٢ - گ . پ پشـــتەو کامێرا ، کوڕەو کچـــە سەیرێکی یەکتری دەکـــەن ، کوڕە بـــەدەست ئیشارەتێکی ئـــەوانە دەکات : وەك بڵێت ... ئەهـــا ئەوانەش چوون بۆ شایەکە ، دەبا ئێمەش بچین .

٣ - ئەنشـــتەو کامێرا ، ســـەرێك ، با ئەدات . بەگۆرانی یەوە :
**- گوڵ نەبی بۆ سەرم ئاڵ چـــەپکی زەرد چەپکی**
**نایەم بۆ زەماوەن نایەم بۆ هەڵپەڕکێ**
[ دەگـــۆڕێت بـــە - گ ] ڕووەو

کامێرا ، گۆرانی یەوە

٤ ـ گ ـ بت دایە دڵ بە من هەموو ماتاوە دوو چەپکت ئەمانی لە باخچەی پاشاوە .

٥ ـ گ ڕووەو کامێرا ، ڕوخساری کوڕە نیشانەی کارێکی گرنگی لێ دەنیشێت . [ دەگۆڕێت بە ـ گ . پ ]

٦ ـ گ . پ کوڕ ـ من کە بە دوو چەپك گوڵ ، بیمە خاوەنی دڵی تۆ ، مەرجە هەر ئێستا بڕۆم ، بۆت پەیدا بکەم ... لێرە چاوەڕوانم بە هەتا دێمەوە . ( لەگەڵ مۆسیقادا ، ڕوو وەردەگێڕێت و پشتەو کامێرا ، دەڕوات .

٧ ـ گ کەمێك تەنشتەو کامێرا ، کچە بە سەیر کردنێکی ، پڕ هیواوە ، سەیری دەکات کە پشتەو کامێرا دەڕوات هەتا وون دەبێت . کچە [ دەگۆڕێت بە ـ ن . د ]

٨ ـ ن . د کچە دەچێتە سەر یەکێك لە بەردە بەرزەکان دادەنیشێت . [دەگۆڕێت بە ـ گش ]

٩ ـ گش کچە لەسەر بەردەکەوە ، ڕووەو دێ ، دەست ئەخاتە ژێر چەناگەی، بیر دەکاتەوە ، کە دەنگی دەهۆڵ و زوڕنای شاییەکە بە نزمی دەبیسترێت .

٨

١ ـ گش کوڕە ، پشتەو کامێرا ، بەدەم مۆسیقاوە ، لە قەراغ ڕووبارێکی خوڕ ڕاوەستاوە ، سەیری دەکات . [ دەگۆڕێت بە ـ ن . د ]

٢ ـ ن . د لەوژم و قەڵبەزەکانی ڕووبارەکە .

٣ ـ بەرە بەرە ، لاپاڵ شاخێکی بەرزی سەخت .

٤ ـ سەرەو کامێرا ، بەرە بەرە سەری شاخەکە .. کە کۆشکێکی پێوە دیارە

٥ ـ ن . د سەرەو کامێرا ، کۆشکە کە .

٦ ـ گ ڕوخساری کوڕەکە بەدەم بیرکردنەوەوە ڕووەو کۆشکەکەی سەری شاخەکە دەڕوانێت ، تێکەڵ بە وێنەی ( ٧ ، ٨ ، ٩ ، ١٠ ) ی ئەم بینراوە ، دەبێت .

٧ ـ ن . د دەرگای گەورەی کۆشك

٨ ـ چەند پاسەوانێك لە بەردەگا ، بەتفەنگەوە پاسەوانن .

٩ ـ گ ڕوخساری پڕ لە خوێنی پاسەوانەکان یەکە یەکە .

١٠ ـ ن . د دیوی دەرەوەی شورەی کۆشك ، پاسەوان بە تفەنگەوە وەستاوە .

١١ ـ گ ڕوخساری کوڕە ، کە ئەو وێنانەی تێدا نەماوە ، ئینجا بەدەم بیرکردنەوەوە ، ڕووەو ئاوەکەی بەردەمی سەیر دەکات .

١٢ ـ ن . د کوڕە هەر سەیری ئاوێکی نیمچە ڕاوەستاوی قەراغ ڕووبارەکەی بەردەم خۆی دەکات .

١٣ ـ گ بەرە بەرە ڕوخساری کچە لە ئاوەکەدا دەردەکەوێت ، کە ئەم گۆرانییە دەڵێتەوە :

ـ بت دایە دڵ بەمن بە هەموو ماتاوە دوو چەپکت ئەمانی لە باخچەی پاشاوە .

بەدەم مۆسیقای گۆرانییەکەوە ، ڕوخساری کچە لە ئاوەکەدا وون دەبێت

١٤ ـ گش کوڕە سەیرێکی ئەوبەر ڕووبارەکەو کۆشکی سەر شاخەکە دەکات و بە گۆرانییەوە :

ـ باخچە پاشا لەوبەر ئاوە

خێڵی دوژمن ، دەورەی داوە
ئەڕۆم ، ڕێگام لێ گیراوە
ناڕۆم ، چاو کاڵ لێم تۆراوە

سەیرێکی کەی کۆشکەکە دەکات و ... بە هێزێکەوە بەرەو ناو ڕووبارەکەوە تەکیان لێدات و

دەچێتە ناو ئاوەکەوە

**٩**

**بە دەم مۆسیقاوە**

١ ــ ن . د کوڕە پشتەو کامێرا ، بەرەو ناوەڕاستی ڕووبارەکە دەڕوات .

٢ ــ لە ناوەڕاستی ڕووبارەکەدا بەرهەڵستی تەوژمی ئاوەکە دەکات کە چەند جارێك لەسەر دەدات و خۆی دەگرێتەوە .

٣ ــ ن ئاوی خوڕی ڕووبارەکە بەرەو کوڕە دێت .

٤ ــ ئاوی خوڕی ڕووبارەکە لە کوڕە ، تێ دەپەڕێت .

٥ ــ گش کوڕە خەریکە بگاتە ئەوبەری ڕووبارەکە .

٦ ــ ن . د ڕووەو کامێرا لە ڕووبارەکە دەپەڕێتەوە دێتە سەر ووشکانی سەر هەڵدەبڕێت و بە شاخەکەدا دەڕوانێت .

**١٠**

١ ــ گش پشتەو کامێرا ، کوڕە بەرەو هەوراز‌ی شاخ مل دەنێت ،

٢ ــ گش بەسەر چەند بەردێکدا سەردەکەوێت لە بناری شاخەکە دا .

٣ ــ ن . د سەرەو کامێرا ، کوڕە بە قەد شاخەکەوە لە نێوان دوو بەرددا وون دەبێت .

٤ ــ ن . د سەرەو کامێرا ، کوڕە بە بەردێکی گەورەی ناوەڕاستی شاخەکەدا هەڵدەزنێت .

٥ ــ گش سەرەو کامێرا ، کوڕە بە لقی درەختێکی نزیك لوتکەی شاخەکەوە بە دەستێکی ، خۆی گرتۆتەوە شۆڕ بۆتەوە خەریکە بکەوێتە خوارەوە [ دەگۆڕێت بە ــ ن . د ]

٦ ــ ن . د ژێرەو کامێرا ، کوڕە بە لقێکی دارەکەوە شۆڕ بۆتەوە هەزار بە هەزارەکەی خوارەوە دیارە

٧ ــ گ ڕوخساری کوڕە تێکەڵ بە وێنەی دەنگی کچە دەبێت کە گۆرانییە کە دەڵێتەوە :

**ــ گوڵ نەبی بۆ سەرم ئاڵ چەپکێ**
**زەرد چەپکێ**
**نایەم بۆ زەماوەن نایەم بۆ هەڵپەڕکێ**

٨ ــ ن . د کوڕە خۆی لەو هەڵوێستە ترسناکە ڕزگار دەکات .

٩ ــ ن . د ڕووەو کامێرا ، کوڕە دەگاتە سەر لوتکەی شاخەکە ، لە پەنای بەردەکانەوە بە سڵ کردنەوەوە ڕووەو کۆشکەکە سەرەنج ئەدات .

١٠ ــ گش دیوی دەرەوەی شوورەی کۆشك ، پاساوڵێك بە تفەنگەکەی شانیەوە لە بەردەم دەرگایەکی بچووکی یەك کەسیی ناو دیواری شوورە کەدا ؛ دێتەو ئەچێت .

١١ ــ گش پشتە و کامێرا ، کوڕە بە ناو بەردەکاندا بە سڵ کردنەوەوە دەچێتە پارێزی پاساوڵەکە .

١٢ ــ ن . د پاساوڵەکە سەرەنجی دیواری شوورەکە دەدات .

١٣ ــ پشتەو کامێرا ، کوڕە لە پاساوڵ نزیك دەبێتەوە ، لە پڕێکدا پەپێکی لێ دەکات . پاساوڵ دادەچڵەکێت و ئاوڕدەداتەوە پێش ئەوەی تفەنگەکەی لە شانی داگرێت ، کوڕە هەڵمەتی بۆ دەبات ، هەردوودەست دەنێتە بینی .

١٤ ــ گ ڕووخساری هەردووکیان لە کاتی ئەم بەگژیەك چوونەدا

١٥ ــ ن . د کوڕە پاساوڵەکە لە پەل و پۆ دەخات ، کە شل دەبێت دەی کوتێ بە زەویدا ، دەسەرەکەی دەئاخنێتە دەمیەوەو دەیبەستێ و چوارپەلی دەبەستێ و ، لیشەکەی دەکاتە پشتی و دەست دەداتە تفەنگەکەی و ، بە سڵ کردنەوەوە لە دەرگا بچووکەکەوە وون دەبێت .

## ١١

بەدەم مۆسیقاوە

١ ـ ن . د — ڕووەو کامێرا ، کوڕە لــە دەرگای دیوی ناو کۆشکەوە بە سەرە تاڵکێ ڕووەو نـــاو بـــاخی کۆشـــک دەڕوانێت .

٢ ـ گش — باخێکی بەرینی کۆشک ، درەخت و سەوزایی و گوڵە جاڕی هەمەڕەنگی لێیە .

٣ ـ ن . د — پاشا و ژنەکەی لەوسەری باخەکەوە بەدەم ووت وێژو پێکەنینــەوە بەناو گوڵەکاندا گەشت دەکـــەن و . . چەند پاسەوڵێك لە دوورییانەوە .

٤ ـ ن . د — نەشـــتە و کامێرا . کـــوڕە بـە ئاگادارییەوە دێتە ناو باخەکەوە لــە پـــەنای قەدی درەختێکـــدا خۆی بووسە ئەدات و ڕووەو پاشـــا و ژنەکەی دەڕوانێت .

٥ ـ ن . د — پاشا و ژنەکەی .

٦ ـ ن . د — کوڕە لە پەنای کۆمەڵێك گوڵی سپی بەرزدا خۆی بووســـە ئـــەدات و سەیری چەند گوڵە جاڕێك دەکات.

٧ ـ ن . د — گوڵە جاڕێکی زەرد ....... گوڵە جاڕێکی سووری دوورتر .

٨ ـ ن — بەناو چەند سەوزایی و ڕووەکێکدا دەڕوات تا دەگـــاتە پەلە گـــوڵە زەردەکــە . . . دادەنەوێتەوە بۆ ناو گوڵەکان .

٩ ـ گ — دەســـتی کوڕە کـــە گوڵی زەرد دەچنێت . . . ناو بەناوێك دەستی لە گـــوڵ چنین ڕادەوەستێت وەك بڵێیت سڵ دەکاتەوەو ئاگـــاداری خۆی دەکات .

١٠ ـ گ . پ — کوڕە بە چـــەپکێك گوڵی زەردەوە ڕاوەستاوە سەیری پـــەلە گوڵە سوورەکان دەکات .

١١ ـ ن . د — پەلەیەك گوڵی سوور .

١٢ ـ ن — کوڕە ڕووەو پاشـــا و ژنەکـــەی دەڕوانێت .

١٣ ـ گش — پاشا و ژنەکە . . . پاسەوڵەکان لــە دوورییانەوە .

١٤ ـ ن . د — نەشتەو کامێرا ، کوڕە دەگاتە گوڵە سوورەکان و دادەنەوێتەوە .

١٥ ـ ن — نەشتەو کامێرا ، پاسەوڵێك بـــە تفەنگەکەی ڕووەو کوڕە نیشـــانی گرتۆتەوە .

١٦ ـ گ — دەستی کوڕە بۆ یەکەم گوڵی سوور درێژ دەبێت .

١٧ ـ گ — دەستی پاسەوڵەکە کە پەنجە دەنێت بە پەلەپیتکەی تفەنگەکەدا .

١٨ ـ گ . پ — ڕووەو کامێرا ، لەگەڵ تەقـــەی تفـــەنگ‌و دەنگدانەوەی تەقەکـــە ، گوڵێك خوێن لەســـەر ســـنگی کـــوڕەنەخش دەبێت . دەنگـــی پاسەوڵەکان :
ها . . دەری نەکەن ! . . . هـــادەری نەکەن بیگرن ! . . دەری نەکـــەن دوژمنــــە ! . . . [ دەگۆڕێت بە ـ ن . د ]

١٩ ـ ن . د — کوڕە بەدەم دەنگی تەقـــەوە خۆی دەگەیەنێتە پەنای قـــەد درەختێك و ڕووەو پاســـــەوڵەکان دوو تـــەقە دەکات .

٢٠ ـ گش — پاسەوڵەکان بە تەقە کردنەوە ڕووەو کوڕە ڕادەکەن .

٢١ ـ گش — کوڕە ڕووەو دەرگا بچووکەکەی ناو شوورەکە ڕادەکات

٢٢ ـ ن . د — دەرگاکە . . . کوڕە بە بازێك خۆی پیا دەکات . . .
چەند گوللەیـــەکی دەستڕێژەکە ، بـــەر دیواری قەراغ دەرگاکـــە دەکەوێت . . جێگـــە گوللەکـــان بڕوشیان ، لێ دەکەوێتە خوارەوە .

٢٣ ـ گش — بنشتەو کامێرا ، کوڕە لــە دەرەوەی شوورەکە بەناو بـــەردەکاندا ڕووەو لێواری شاخەکە ڕادەکات .

٢٤ ـ ن . د — کـــەمێك نەنشــــتەو کامێرا ، پاسەوڵەکان لە دەرگای شوورەکەوە دێنـــە دەرەوە ، ڕووەو کـــوڕە دەستڕێژ دەکەن .

٢٥ـ گش کوڕه له نزیك لێواری شاخه‌که‌وه
ته‌قه‌یه‌ك له یاساوڵه‌کان ده‌کات و..
له لێواری شاخه‌که‌وه ون ده‌بێت.

٢٦ـ ن . د یاساوڵه به سترا‌وه‌که ، ده‌که‌ونه
جووڵه جووڵ .

٢٧ـ له‌نشته و کامێرا . یاساوڵه‌کان
ڕووه‌و ون بوونی کوڕه ده‌ڕوانن .
هێندێکیان ده‌کێشن به ئه‌ژنۆیانا و
... هێندێکیان لێویان ده‌کرۆژنو
... ئینجا به‌ره‌و لێواری شاخه‌که
ڕاده‌که‌ن .

## ١٢

به‌ده‌م ده‌نگی نزمی ده‌هۆڵ و
زوڕناکه وه

١ ـ گ . پ له‌نشته‌و کامێرا ، کچه له‌سه‌ر
به‌رده‌که دانیشتووه ده‌ستی
خستۆته ژێر چه‌ناگه‌ی ،
چاوه‌ڕوانی کوڕه‌یه . له دووره‌وه ،
دێیه‌که دیاره .

( ده‌نگی خشه‌ی گه‌ڵاکانی سه‌ر
زه‌وی ناو باخه‌که )

( به‌ده‌م مۆسیقای گۆرانی‌یه
که‌وه )
کچه ناوڕ ئه‌داته‌وه به‌لای باخه‌که‌دا،
له پڕێکا ڕووی ده‌گه‌شێته‌وه ،
هه‌ڵده‌ستێته سه‌رپێ [ ده‌گۆڕێت
به ـ ن . د ] به خۆشیه‌وه له‌به‌رده‌که
دێته خواره‌وه .

٢ ـ ن . د پشته‌و کامێرا ، کچه ئه‌چێت به
پێشوازی کوڕه‌وه

٣ ـ ڕووه‌و کامێرا ، کوڕه له کچه نزیك
ده‌بێته‌وه ، تفه‌نگ و فیشه‌ك لغه‌که‌ی
پێ‌نیه . چه‌پکێك گوڵی زه‌ردی
به‌ده‌سته‌وه‌یه ، به‌یه‌خه‌ی چۆغه‌که‌ی
برینه‌که‌ی سه‌رسنگی داپۆشیوه ..
به‌گۆرانی‌یه‌وه :

ـ به‌باخچه‌ی پاشادا وورد گه‌ڕام
خوارو ژوور زه‌رد هه‌بوو بۆم
چنیت ، چنگ نه‌که‌وت گوڵی سوور

نازانم له‌مجا دێیت بۆ شایی و
هه‌ڵپه‌ڕکێ ؟

٤ ـ به‌ده‌م مۆسیقای گورانی‌یه‌که‌وه ،
ڕووه‌و کامێرا ، کچه گه‌شبی
ڕوخساری ده‌گۆڕێت به په‌ستیی و
ڕووی لێ وه‌رده‌گێڕێت و ،
به‌گۆرانی‌یه‌وه :

ـ نایه‌م گوڵ ماوێتی بۆ سه‌رم
سوور چه‌پکێ .

به‌ده‌م مۆسیقای گۆرانی‌یه‌که‌وه کچه
ده‌چێته ژێر دره‌ختێك داده‌نیشێت
که دیمه‌نی دووری دێیه‌که ، ده‌بێته
باك گراوند .

٥ ـ ن . د له‌نشته‌و کامێرا ، کوڕه به‌ده‌م
مۆسیقای گۆرانی‌یه‌که‌وه ،
له‌سه‌رخۆ دێت ، له ته‌نشت کچه‌وه
داده‌نیشێت و یه‌خه‌ی چۆغه‌که‌ی
بۆ ده‌کاته‌وه‌و ، زامه‌که‌ی سه‌ر
سنگی نیشان ئه‌دات که گوڵێك
خوێنی پێوه‌یه ، به‌گۆرانی‌یه‌وه :

ـ ناته‌وێ ئه‌م زامی سه‌ر دڵه‌م
له‌باتی ؟

٦ ـ ڕووه‌و کامێرا ، کچه ده‌ستێك
ده‌خاته سه‌ر شانی کوڕه‌و به
گۆرانی‌یه‌وه :

ـ هه‌ی هاوار لفه‌نگی دوژمنیش
پێکاتی

له‌سه‌رخۆ سه‌ری کوڕه ده‌کاته سه‌ر
ڕانی خۆی‌و به‌گۆرانی‌یه‌وه :

ـ ڕاکشێ تاوێ سه‌ربنێره سه‌ر
ڕانم

با بگریم بۆ دڵی بۆ گوڵی
لۆڕانم

ته‌نشته‌و کامێرا . کوڕه به‌ده‌م
مۆسیقای گۆرانی‌یه‌که‌وه ، ـ
به‌رز ده‌کاته‌وه‌و ، داده‌
به‌گۆرانی‌یه‌وه .

ـ ئەو دڵەی من کە بۆتۆ دروســـت
کراوە

ناگۆڕێت و نە دۆڕاوە
دەستی کچە دەگرێـــــت و ،
هەڵدەسنە سەرپێ

گۆرانی کوڕە بەردەوامە :
ـ گوڵەی پاشا کار ناکاتە ســــەر

ئەو دڵەی
کە خۆشەویستی تیا ڕوواوە

ڕوورەو کامێرا ، | دەگۆڕێت بـــە ـ
گ . پ| گۆرانی کوڕە بەردەوامە :
ـ خۆشەویستم ! شایستــــــەی
گوڵی گەشاوە

ئاواتەکەت هەر دێتـــــەدی و بە
سەروپێچی ڕازاوە بەرە بـــــەرە
|دەگۆڕێـــــت بە ـ گ] گۆرا...

کوڕە بەردەوامە :

ـ لە شاییــــدا بە یەکـــــــەوە
هەڵدەپەڕین

بەرە بەرە هەردوو چاوی کوڕە کـە
ڕووەو کامێرا دەڕوانێت ، لـــــە
وێنەیەکـــــی [ز.گ ] دا ....
گۆرانی‌یەکە بەردەوامە :
١٠ ـ ن.گ ـ بە گوڵی ئاڵ و زەردی باخچــەی
پاشاوە .
لە کۆتایی گۆرانی‌یەکەدا ، هەردوو
چاوی کوڕە

لە وێنە [ز.گ] کەدا ، بە نەگۆڕیی
وەك ڕەسم دەمێنێتەوە ، دەبێتــە
باك گراوندێك ، کە بەشی کۆتایــی
تایتڵەکەی لەســــەر نیشـــان
دەدرێت .

کۆتایــی

لقمان عباس

# ئایا ژیان لە دەرەوەی زەوی هەیە

ئەم پرسیارە لە کۆنەوە بیری مرۆڤی خستۆتە کار ( ئایا ژیان لە ئەستێرەیەکی تری ئەم گەردوونە هەیە ! )

بوونی ژیان لە شوێنێکی تری گەردوون پێویستە یەکسەر نەهی لێ نەکرێ ، یا لەژیانی سەر ئەم زەوی‌یەش نەکا .

زاناکانو ئەو مرۆڤانەی کە خەریکی هاتو چۆکردنو دۆزینەوەی ئەستێرەکانن تا ئێستا نەگەیشتوون بەوە کە ژیان لەسەر ئەستێرەیەکی تر هەبێ تەنانەت ناشزانن لە کوێ ژیان‌هەیە هەرچەندە تەنها بە لایانەوە وایە یا ئەوەندەی عەقلیان بۆ بچێ ئەو ئەستێرەیەی کە لە ڕژێمی خۆری بەشدار بێ وە لەو باوەڕەدا بن کە ژیانی لەسەر هەبێ دە هەزار ساڵ [ بە روناکی ] لە ئێمەوە دوورە .

بەڵام توانیویانە چەند ئاوێنەیەکی ئەندامی لەسەر هەندێك ( نیازك ) ببینن ئەویش وا بڕوا ئەکرێ کە بەهۆی تیشکی گەردوونی‌یەوە ( الاشعة الكونية ) وە لەگەڵ توخمی نیازك دروست بووبن .

بەڵام لەگەڵ ئەو ئاوێنە ئەندامی‌یانە هیچ نیشانەیەکی ژیان نەبینراوە . هەروەها ڕووانگەی ئەلەکی نیشانی داوە کە وتومە گەردوونی‌یەی لە نێوان ئەستێرەکاندا هەیە ماددەی کیمیکیو فیزیکی ئاڵۆزەو تەنها بریتی نیە لە هایدرۆجینو توخمی ساکار ، بەڵکو لە توخمی ئاڵۆزیش پێك هاتووە کە بەشێك لەو توخمە ئاڵۆزانە ئەندامین . ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە ژیان لەگەڵ پەیدابوونی ئەستێرەکانەوە هەبووێ .

وەك ئەزانین مرۆڤی ئێمە تا ئێستا شارستانێتی‌یەکی زیتی سەر ئەستێرەیەکی تری ئەدۆزیوەتەوە ، بەڵام لەوانەیە مرۆڤی یا زیندەوەری ئەستێرەیەکی تر هاتبنە سەر زەوی‌و ئێمەیان دۆزیبێتەوە ، بەڵێ ئەمە دوور نی‌یە !... سەلماندنی ئەمەش بە چەند ڕاستی‌یەکە کە بۆمانی دەرئەخاو زۆر ئاشکراشی ئەکا لە زیندەوەری لە ئێمە زیرەك ترو پێشکەوتوو تر لە شوێنێکی نەناسراوی گەردوون ئەژینو ئێمەو زەوی‌یەکەمانیان دۆزیوەتەوەو ئەتوانین بڵێین دۆزینەوەکەیان لە کۆنەوەیەو بەڵام ئێمە پێمان نەزانیوە تا ئەم ڕۆژانە یا ئەم ساڵ . یەکێك لەو ڕاستی‌یانە بینینی ( تەنی فڕیوی نەناسراو )ە یا کەشتی ئاسمانی نەناسراو واتە هی زەوی ئێمە نی‌یە . ئاشکرا ترینیان ئەو ڕووداوەیە کە بەم زووانە لە کوێت رووی دابوو . ئەویش لە بنکەی پەستاندنی نەوتی کۆمپانیای نەوتی کوێت ، فەرمانبەرانی بنکەکە بەهۆی تەلەفزیونی ئاگادار کردنەوەی ئەلیکترۆنی کە لە کارکەوتنی ئامێرەکانی بنکەکە ئاگادار ئەکاتەوە ، پێیان زانی کە ئامێرەکان لە کار کەوتووە . بۆیە حەوت ئەندازیارو شارەزایەکی بێگانە چوونە شوێنەکە . بەڵام بینیان ( ۲۵۰ ) مەتر لە بنکەکەوە تەنێکی خری تەشیلەیی لووتکەیەکی سووری هەیە نیشتوەتەوە بەڵام کاتێك سەریان زیاتر سووڕما کە بینیان هەموو دەرگاکانی بنکەکە کراوەتەوەو ئامێرەکانیش هەمووی کپ بووە . ویستیان لێی نزیك ببنەوە بەڵام بەرەو ئاسمان دەرپەڕیو یەکسەر بنکەکەش هەر لە خۆیەوە کەوتە کار . جگە لەمەش ئەو چیرۆکە سەیرەی کە بەسەر دوو کرێکاری ئەمەریکایی هاتبوو ... تی زیاتر ڕوون ئەکاتەوە :ــ

هیکسۆتو پارکەر دوو کرێکاری ئەمەریکایین لە ویلایەتی ( میسوزی ) ، ئەچن بۆ مینای ( باسکاجولا ) لە شوێنێکی بەجێ هێشتراوی‌دا بۆ ئەوەی ئەو ئێوارەیە بە ڕاوە ماسی ببەنە سەر ، بەڵام پێش ئەوەی هیکسۆت چەنگاڵەکەی فڕێ داتە ناو ئاوەکەوە ، چی ڕووی دا ؟ دەنگێکی ناخۆشو بێزار کەرو نەبیستراو ئاسمانی بان سەریانی پڕ کرد ، بینیان کەشتی‌یەکی ئاسمانی هاتە خوارەوە لە بەر دەمیان نیشتەوە ، بەڵام نیشتنەوەکە پێیەك لە زەوی‌یەوە بەرزبوو ، کەشتی‌یەکە تیرەکەی ( ۱۳ مەترو ) بەرزی‌یەکەی ٥ر٢ مەتر ئەبوو ؛ لەم لاو ئەو لایدا وەك پەنجەرە کرابووەوە

... هەر یەکەیان بە سەرسامی‌یەوە سەیری ئەوی کە ئەکاو . ئەیانەوێ ڕاکەن ، بەلاّم پێیان سڕ ئەبێو ناتوانن جووڵە بکەن ، کاتێك ترسیان زیاتر لێ نیشت ڕووناکی‌یەکیان دیو .. سێ زیندەوەری سەیر ( لە شێوەی مرۆڤ ) لە گەشتی‌یەکەوە دەرچوون !..

هیکسۆت دەڵێ : بەرەو ئێمە هاتن بەلاّم لەسەر پێ نەئەڕۆیشتن ، لە هەوادا ئەڕۆیشتن وەك فلیمی هێواش کە هەندێ جار لە فلیمەکانی سینەماو تەلەفزیون پیشان ئەدرێ . شێوەیان زۆر سەیر بوو ؟ ڕووت بوون . درێژیان مەترێك‌و نیو ئەبوو ، پێستیان سەوزێکی زەرد باوی بریقە دار بوو ، بەلاّم پێیان وەك پێی فیل خڕ بوو ، دەستیشان وەك مەقاش بوو ، لە ڕوویانیشدا چاو نەبوو بەلکو خەتێك وەك پەردەو شتێکیش لە جیاتی لووت‌و دەرچەیەکی بچووکی بۆ لێویش لە جیاتی دەم . هەردوکمان دەمار مان‌گیرا . ئەوانیش ئێمەیان گرت‌و خستیانینە ناو گەشتی‌یەکەیانەوە ، لە ناویدا کوت‌و پڕ هەستم بە نەمانی کێشی خۆم کرد ، ئەنجا یەکسەر ئامێرێکم لە بەردەمم بینی وەك سەبەتە وابوو . ئامێرەکەش هەر لە هەوادا بوو شتێکی گەورەش وەك چاو وا بوو لە پێشم بوو ، نەم توانی لە هیچ بکەم ،هیچم پێ نەزانرا چاوە گەورەکەش لە دەورم ئەسووڕایەوەو دوو زیندەوەری لەوانەش بە هەموو لایەکدا ئەمیان سوڕاندەوە ، هەستم بە هیچ ئیشێك نەکرد تەنها ترسێکی زۆر نەبێ ، ئەوانیش نەیانەویست ئازارمان بدەن . هەروەها هەوڵی ئەوەشیان نەدا کە لە یەکتر بکەین ، ئەمجا دەریمان هێنایە دەرەوەو لە جێکاکەی خۆم دامیان ناو ، پاش ماوەیەکیش پارکەریان هێناو بە تەنیشتمەوە لە جێی خۆی دایان نا ئەمجا چوونە کەشتی‌یەکەیانەوەو کەشتی‌یەکە وەك تیر بەرەو ئاسمان فڕی‌و لە ماوەی یەك دوو چرکە بە تەواوی بزر برو . ئێمەش ماوەی چەند خولەکێکیش هەر بە سەرسامی‌یەوە بەرامبەر یەك وەستاین بۆ ئەوەی بتوانین زمانمان بجوولێنین . ئەمجا بە پارکەرم ووت کەس بڕوامان پێ ناکا ، بەلاّم پێویستە بۆ یەکێکی بگێڕمەوە ئەگینا شێت ئەبم .

هیکسۆن‌و پارکەر لای ئەفسەری پۆلیس ( کلان رایدەر )و بەسەرهاتەکەیان بۆ ئەگێڕنەوە ، لە ڕاستیدا بڕوایان پێ ناکا بەلاّم هەرچۆنێك بێت قسەکانیان سەرنجی ڕاکێشا . بۆیە مارشال ( فرێد رایمۆن ) هەڵئەسێ بە تاقی‌کردنەوەیان بە ئامێری درۆ دەگرن ، بە تاك‌و بە جووته بستە تۆمارکەری قسەی بێ‌دەنگ ( واتە ئەو قسەیەی کە لە دڵەوە ئەکرێ ) بۆی دەرکەوت هەموو قسەکانیان ڕاستن .

هەروەها دکتور ( جیمس هاردنر ) لە زانکۆی کالیفۆرنیاو دکتور ( ئەلین هانباك ) مامۆستای فەلەك ، هەڵسان بە تاقی‌کردنەوەیان بە ڕێگەی ( خەوتنی موگناتیسی ) بینیان هەرچی پرسیاریان لێ ئەکەن بە تەواوی وەلاّمی ئەدەنەوە .

هەرچی کەشتیەوانە ئاسمانیەکانیشن شتی زۆری سەیریان دیوە یەکێك لەوانە کەشتیوان ( گۆردن ) بوو لە ١٣ ی ئەیلولی ١٩٦٦ توانی وێنەی یەکێك لەو کەشتی‌یە ئاسمانیانە بگرێ لە سووڕی هەژدەمینی بە دەوری زەوی هەروەها هاوڕێ‌کەشی ( ئۆلدرین ) وێنەیەکی گرتبوو کە زۆر لە یەکتر ئەچوون ـ هەرچی کەشتیوانە سۆڤیەتی‌یەکانیش لە ٨ ی ئازاری ١٩٦٤ هەواڵی بینینی ( تەنی فڕیو )یان گەیاند بە زەوی کە دیویانە بەرەو زەوی هاتوون .

دیسانەوە سەرژمێری‌یەك دەری خستووە کە ١٥ ملیۆن ئەمەریکی ئەو کەشتی‌یانەیان دیوە کە زۆربەیان هی ئەم ڕۆژانەیە لە بینینی ئەو کەشتی‌یانەدا توانراوە هەندێك لە سیفەتەکانیان بزانرێ وەك شێوەو جووڵانەوە بەلاّم ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە ڕوانگە ئاسمانی‌یەکان‌و رادارەکانی زەوی ئێمە بەهیچ ناتوانن هەست بە هاتن‌و چوونیان بکاو بچنە هەر شوێنێکیش گەر ئامێری لێ بێ ئەوا لە کار ئەکەوێ .

هەر لەبەر ئەم سیفەتە سەیرەشیانە کە چەند ڕووداوێکی سەیر تر ماوەیەکی زۆرە ڕوو ئەدا بەلاّم بێ ئەوەی بزانرێ کە خاوەنی ئەو ڕووداوانە ئەوانن ، تەنانەت زاناکانیش نەیان توانیوە دەری بخەن کە ئایا ڕووداوی فیزیکی گەردوونی‌یە یا شتێکی ترە ، بەلکو ئەوانیش هەر وەکو من‌و تۆ سەریان لیا سووڕ ماوە ، تا لەم ڕۆژانەدا توانیویانە دان بەوەدا بنێن کە کرداری خاوەنی ئەو کەشتی‌یانەن .

گرنگترین ئەو ڕووداوانەی کە ڕوو ئەدەن لە ناوچەیەکی سێ گۆشەیی لە ناو دەریای ( کاریبی ) لە ئۆقیانوسی ئەتلەنتیك لەنێوان دوور گەی ( برمۆداو فلوریداو بورتوریکو ) کە ناو نراوە سێ‌گوشەی برمۆدا لەم ناوچەیە سەدەها پاپۆڕو فڕۆکە گم بوونە

بەوێدا بە کەس نەزانی بزربوونەو هیچ نیشانەیەکیان لە دوای خۆیان جێ نەهێشتووە . هەروەها لە کاتی ڕەت بووندا بەوێ گەر هیچ نەبێ کات ژمێرو ڕادیۆو بێ تەلەکانیان تێك نەچێو لەکار نەکەون . سەیرترین ڕووداو بەسەرهاتی پێنج فڕۆکەی گەورەی جەنگی ئەمەریکایی لەجۆری ( T. B. M 3 Finger ) بوو لە ٥ ی کانوونی یەکەمی سالی ١٩٤٥ لە ویلایەتی فلوریدا کاتێ کە لە فڕیندا بوون لە کاتژمێری یەکی پاش نیوەڕۆ ، ( چارلز تایلەر ) ئەفسەری فڕۆکەیەکیان بوو خەبەری دا بە بنکەی چاودێری کردنی فڕۆکەخانە وتی لە تەنگانە دابن ، هیچمان بۆ ناکرێ ، زەویمان لێوە دیار نییە .

بنکەکە داوای کرد کە شوێنەکەیان دیاری بکەن پرسی بەوەو کوێ ئەفڕن ؟ چارلس لە وەلامدا وتی نازانین ، لە کوێین بزر بووینە. تەنانەت ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاواش نازانین لە کوێیە !.. هەروەها دەریاکەش لە دەریا ناچێ !! قیبلەنوماکە تێك چووە ، بە شێوەی نەجوولێیەوە ؟! لەم کاتەدا بێ تەلەکەیان ئەوەستێ نیتر دەنگیان بەیەك ناگا . بەلام بنکەکە توانی کوێیان لێ بگرێ کە لە ناو خۆیان ئەدووان بەلام کەمە کەمە دەنگەکانیشیان بەرەو نەمان ئەچوو تا دوا ڕستە کە گوێیان لێ بوو ئەوە بوو : ( ئەلێی ئەچنە ناو ناوەوە ؟ ) . ئەوانیش هەر بە پەلە فڕۆکەیەکیان نارد بۆ پشکنینیان بەلام ئەویش لەناو چوو هەروەها هەولێکی زۆریان دا بۆ دۆزینەوەیان چ لە دەریاو چ لە ووشکان بەلام هەر نەبوون .

هەروەها لە سالی ١٨٨٤ دا هەر لە ناوچەی برمۆدا کە چوونە سەر پاپۆڕی ( سانتا ماریا ) بینیان هەموو دەریاوانەکانی مردوون ، بەلام چۆن مردوون ؟ کەس نازانێ ، تەنانەت دکتورەکانیش نەیانزانی بە چ هۆیەك مردوون !.. جگە لەمەش بە سەدەها پاپۆڕ نزیکەی هەزار دەریاوان لە سێ گۆشەی بەرمۆدا لەناو چوونە دیسان بە شێوەیەکی کەس نەزانی . بەلام سەیرترین ڕووداو کە لە ووشکان ڕووی دابێ لە ٢٨ ی ئابی سالی ( ١٩١٥ ) لە کۆتایی ڕۆژانی جەنگی جیهانی یەکەم کە ئوسترالییەکان بەشدارییان تیا کرد لە کوشتاری ( گردی ژمارە ٦٠ ) . ڕۆژێکی خۆشو ئاسمان هەوری پێوە نەبوو . خۆریش بە دەرەوە بوو ، کاتێ کە نزیکەی سەد سەربازی ئینگلیزی بەرەو گردی ژمارە ٦٠ ئەڕۆیشتن . بینرا شەش حەوت تەن (جسم) لە شێوەی هەورێکی درێژ دەورەی گردی ژمارە ( ٦٠ )یان دا ، ئەمجا یەکێك لەو هەورانە بە تەنیا ئەسوڕایەوەو ئەوانی کەش لە جێی خۆیان وەستابوون هەورەکە بە تەواوی هەموو سەربازەکانی داپۆشی ، بەلام ئەوانە کە چاویان لێ بوو هیچ تەقەو شەڕو بلاو بوونەوەی سەربازەکانیان نەدی . ئەمجا هەورە تەنیاکە دەستی کرد بە ڕۆیشتنو ئەوانی کەش بە دیمەنێکی زۆر سەیر دوای کەوتنو ڕۆیشتن . هەر ئەوە بوو ئیتر سەربازەکان نەمانو لەناو چوون . ئەم بەسەرهاتەش زۆر کەس بەچاکی بینی بوویان .

بێ گوومان ئەم هەموو ڕووداوە سەیرانەو هەزارەها ~~بێ گومان بوونی ئەم میوانانە کە زەوی ئێمە ئامایشت~~ ڕووداوی کەش بۆمانی ئەسەلمێنێ کە ئەوان شارستانێتییەکی ئێجگار پێشکەوتوویان هەیە . بێ گومان بوونی ئەم میوانانە کە زەوی ئێمە ئامایشت ئەکەن ئەمانخاتە ئەو باوەڕە کە بلێین جگە لەمانە شارستانێتی کەش لە گەردوون هەیەو لەیەکو دوو زیاتریش ، جا هەر لەبەر ئەم بیروڕایە زاناکان لەو باوەڕەدان کە ئەو شارستانێتییە نەناسراوانە لەوانەیە ئەوانیش وەك ئێمە بە دوای دۆزینەوەی شارستانێتی تر بگەڕێنو بەو مەبەستە ( نامەی تیشکیو ئیشارەت) مان بۆ بنێرنو ئێمەش هەولی ئەوە بدەین کە لێی تێ بگەینو وەلامیان بدەینەوە . بۆیە زانا فەلەکییەکانی ئەمەریکا خەریکی دامەزراندنی ئەو جۆرە بنکانەنو چەند ڕێو شوێنێكو نەخشەی ئامێرەکانیان کێشاو کە بەو پێیە بتوانن لە هەموو شەپۆلێکی بێ تەل تێ بگەنو بە ئاسانی وەری بگرنو هەموو ئیشارەتیکیش شی بکەنەوەو لە ماناکەی تێ بگەن . ئەم پرۆژەیە بڕیار وایە لە سالی داهاتوو دەست بە دامەزراندنی بکرێ .

ئەمجا ئەوەی کە ئەبێ لە یادمان نەچێ : ( ئێمە بە تەنها لە گەردوون ناژیین ) .

## سەرچاوەکان

١ ) ڕۆژنامەی الجمهورية ، ٩-١٠-١٩٧٨
٢ ) پاشکۆی ڕۆژنامەی الجمهورية ( طب وعلوم ) ، ٢٣-١١-١٩٧٨
٣ ) ڕۆژنامەی الراصد ، ٢٠-٥-١٩٧٨
٤ ) گوڤاری الف باء ، ٢١-٥-١٩٧٨
٥ ) پاشکۆی ڕۆژنامەی الجمهورية ( طب وعلوم ) ، ٢٨-١٢-١٩٧٨

# ئەرشیف و مێژووی و چەشنەکانی

## بەشی یەکەم

### ١ ـ ئەرشیف لە لایەنی زاراوەوە Archives

دەتوانرێت بۆ ناسینی زاراوەی ئەرشیف بووترێت کەوا دەستە ـ یەکە ئەرکی پاراستنی بەلگەنامەو دۆسیێو تۆمارو نووسراوەکان بە شێوەیەکی ڕێکو پێك لە ئەستۆ دەگرێت ، ئەمانەیش چی لە دەزگایەکی گشتی یان نیمچە گشتی‌یەوە دەرچووبن ، ئەگەر دایەرەی کاروبار بن یان دەستەیەکی تایبەتی Privyentity هەروەها دامو دەزگار بەرژەوەندی و کومپانیا حکومەتییەکانیش کە ئیشو کارەکانیان پەیوەندی‌ی بەو شتانەوە هەیەو خۆیشیان ئەرکی پاراستنو چاودێری کردنیان لە ئەستۆ دەگرنو کاربەدەستانیان بەرو دووا یان هەر لایەنێکی راسپێردراو ئاگاداری‌ی پاراستنیان دەکەن ئەویش لە چوارچێوەی فراوانبووـ نەوەی واتای بنەرەتی‌ی ئەرشیف کە مەبەستەکەی پاراستنی ئەم شتومەکانەیە . هەروەها بریتی‌یە لە پاراستنی ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە ڕەچەلەكو مێژووی سەجەرەی خێزانانو ناودارانەوە هەیەو پاراستنیان بۆ ئامادەکردنی سەرچاوەی بنەڕەتی‌و بەلگەو پشتیوانی مێژووی وولاتو نەژادی گەل بەکەلکە. (١)

ووشەیەکی تریش هەیە لەم بوارەدا بەکاردەهێنرێت ئەویش ووشەی «بەلگەنامە یان تۆمارە "Records"» کە لە بریتانیادا باوە دەلێن « دەزگای بەلگەنامەکان ـ "Records Office" هەروەها لە وولاتی کۆمنویلسدا .

دامو دەزگاو دایەرەکانی ئەرشیف . بەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ تێی دەگەین لە مێژە دامەزراون . لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسی‌و ، دامەزراندنی ئەرشیفی نیشتمانی‌ی فەرەنسی لە سالی ١٧٨٩ داو ئەرشیفە ناوچەییەکان لە سالی ١٧٩٦ دا دەست پێ‌دەکات . ئەوسا بۆ یەکەمین جار بەڕێوەبەرییەکی یەکگرتووی ئەرشیفەکان پەیدابوو کە پێخو شحالی‌و ئامادەیی خۆی ڕاگەیاند بۆ وەرگرتنی هەرچی کۆمەلە ئەرشیفێك کە لە دامو دەزگاو ئەمبارو دایەرەکاندا چەشنێکی ناڕێك پارێزرابوونو پەرتو بلاو کرابوون .

ئەنجامی کاریش ئەوە بوو :

١ ـ ئەرشیفی نیشتمانی‌ی فەرەنسی دامەزرا کە بوو بە یەکەمین بەڕێوەبەرێتی‌ی دەزگایەکی نیشتمانی‌ی سەربەخۆی ئەرشیف.

٢ ـ دەولەت ددانی بەوەدا نا کە پاراستنی کەلەپووری بەلگەنامەکانی خۆی‌و چاودێری کردنی سەرچاوەو سامانە ڕۆشنبیری‌یە بەکەلکەکان کە بەلگەنامە نەتەوەییەکان دەنوێن کارێکە لە ئەستۆی خۆیدایە .

٣ ـ بڕیار درا کە ڕێ بە خەلکی بدرێت بچنە نێو ئەرشیفو سەیری ئەو شتانە بکەن کە تێیدان ئەنجا لە لێکۆلینەوەو تۆژینەوە زانستی‌و ڕۆشنبیری‌و کۆمەلایەتییەکاندا سوودیان لێ وەربگرن .

لەگەل ئەوەیشدا تاکوو سالی ١٨٤٠ ئەوا یاسای بنەرەتی Basic Canon کە تا ئەمڕۆیش کاری پێ دەکرێتو مەبدەئی «ڕێزگرتنی کۆمەلە بەلگەنامەکان»ی تێدا چەسپ کراوە چەند جارێك لە فەرەنساو بەلجیکدا دەستکاری کراوە ، ئەنجا هۆلەندەیی‌و بروروسیاییەکان بژاریان کردو مەبدەئێکی نوێیان خستە ناریەوە کە ئەویش « جێگیربوونی کۆمەلە بەلگەنامەکان »ە ـ (( Stability Within the founds ))

بەلام لەلایەنی مێژووەوە ، ئەوا بەکارهێنانی ووشەی ئەرشیف لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تر دەگۆڕێت ، هەروەك چۆن لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا واتای ئەرشیف فراوان دەبێتەومو هەموو بەلگەنامەکانی دامو دەزگا تایبەتی‌و گشتی‌یەکان دەگرێتەوە . بەلام لە بوارێکی تەسكتردا ، یان کەم بلاودا ، هەر بەلگەنامەی خێزانو تاکە کەسان دەگرێتەوە کە زۆر جار بە «بەلگەنامەی تایبەتی یان کاغەزی کەسی Personal papers هەندێك جاریش لە بوارێکی تەسکدا بە «دەستنووسە مێژوویيەکان » ناودەبرێن ، ئیتر دەتوانرێت ووشەی ئەرشیف بەو واتایانەی خوارەوە بەکار ببرێت :

١ـ هەر دەزگایەك یان دایەرەیەك کاری ئەوە بێت چۆنیەتی‌ی

بەلگەنامەگان دیاری بکات‌و نرخیان‌و چۆنیەتی‌ی پێ‌گەیشتن‌و پاراستن‌و ڕێکخستن‌و وەسف کردنیانی پێ سپێررابێت ، لەگەڵ ئامادەکردنی کاروباری تایبەت بە چاوگ‌و سەرچاوە سوودبەخشەکاندا ، هەرروەها نرخاندنی بەلگەنامەو ئەو کافەزانەی نرخی کاتی‌یان هەیەو دوورخستنەوەیان بڕیار بدات .

٢ ـ ووشەی ئەرشیف بۆ خانوویەك یان لایەکی یان بەشێك لە بەشەکانی بەکار دەهێنرێت کە شتومەکی ئەرشیفیان تێدا پارێزرێت ، بە مەرجێك شوێنی بەڕێوەبردن‌و ، ئاسان کردنی کاروبار بۆ هەمور ئارشیفیست‌و ئەوانەی کاروباری بەلگەنامەکان دەگێڕن تەرخان بکرێت ، سەرەڕای ئەو کەس‌و توێژینەوەرانەی پێویستیان بە بەلگەنامە دەبێت بۆ مەبەستی خوێندن‌و لێکۆلینەوە بەکاریان دەهێنن .

**٢ ـ ئەرشیف لە لایەنی زمانەوە .**

ووشەی «ئەرشیف Archive“ بە دوو شێوە هاتووە ، فرمان‌و ناو، وەکوو فرمان بە واتای کاغەزو فایلەکانی خستە ئەرشیفەوە ، فرمانی رابوردووی Archived بەواتای ئەرشیفی کرد . هەرروەها هەمیشە بەشێوەی ناوی کۆ archives هاتووە ، ووشەی ئەرشیف لە ووشەی (ئارخیۆن یان ئارشیۆن Archeion )ی لاتینی‌یەوە هاتووە کە بە بازنێك لە بازنەکانەوە دەلکێت ، لە بنەڕەتدا بە دۆسی‌و بەلگەنامەکانی میری دەووترا ، واتە ئەرشیفی گشتی. بەکارهێنانی ئەرشیف لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا باوە ، بە فەرەنسی پێی دەووترێت (ئارشیف) ، بە ئنگلیزی ( ئارکایفز ) کە لە سالی ١٦٠٠ دا بۆ یەکەمین جار بەکارهێنرا لەمە ـ یشەوە ووشەی ( ئارکایفیست Archivist ) بە ئنگلیزی‌و ئارشیفیست بە فەرەنسی کە واتای ( بەلگەنامەکار) دەگەیەنێت یان ئەو کەسەی لە ئەرشیفدا کارێکی بەرزی لەژێر دەستە ـ لاتدایە.

دەستەلاتی بەلگەنامەیی (ئەرشیفی)
Archival Authority

بەلگەنامەی ئەرشیفی
Archival Document

ئامۆژگا یان دەزگایەکی ئەرشیفی
Archival Institution

سەرچاوە ئەرشیفیەکان
Archival References

زانستە ئەرشیفیەکان
Archival Sciences

لێکولینەوە ئەرشیفیەکان
Archival Studies

زانستی ئەرشیف کردنیش پێی دەگوترێت ( ئارشیفۆلۆژی Archivology ) کە چاووکی ووشەکە ئارشیفاج = ( Archivage ) • ، لێرەدا ووشە فەرەنسی‌یەکە بەکار دەهێنرێت چونکە فەرەنسییەکان یەکەمین کەس بوون بەکاریان هێناوە ، بۆیە بەم شێوەیە بلاو بووەتەوە .

ووشەی ( پری ئەرشیفاج ـ Pre-archivage- ) یش واتای بەر لە ئەرشیف کردنە وەك چۆن بە ئنگلیزی دەلێین (Prehistory) بەر لە مێژوو .

پری ئەرشیفاجیش لە قۆناغە گرنگەکانی کاروباری ئەرشیفە کە وا ئەو قۆناغە دەگەیەنێت کاغەزو بەلگەنامەکانیان پێدا تێدەپەڕێت بەر لەوەی وەربگیرێن‌و پێڕست بکرێن‌و شێوەیەکی هونەری هەلبگیرێن تاکوو بە ئاسانی لەلایەن لێکۆلەرەوەکانەوە بەکار بهێنرێن ، تا لەم بارەدا بەلگە ـ نامەیەکی ئەرشیفی
Archival Document

لە هەندێك وولاتدا بەکارهێنانی ووشەی Record ڕیکۆرد بە باشتر دەزانن بۆ دەستنیشا ـ نکردنی بەلگەنامەی ئەرشیفی وەك لە دەولەتانی کۆمنوێلس‌و وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بەکاری دەهێنن .

با تۆزێك لەلای ووشەی (ئەرشیف کردن ـ الارشفة) * رابوەستین وەك چاوگێك لەسەر کێشی ( فعللة = سێ بڕگەیی ) دەلێین بۆچی لە زمانەکەماندا بەکاری نەهێنین ، مادام چەندین ووشەی بێگانەی شارستانیانەمان بەکار هێناوە لەوانەیشدا ( ئەرشیف ) هەول دەدەین هەر سێ‌کاتی فرمانی لێوە وەربگرین دەلێین :

ارشف ئەرشیفی کرد
لە رابوردوودا
یۆرشف ئەرشیف دەکات
لە ئێستادا (رانەبوردوو )
ارشیف• ئەرشیف بکە
(بۆ فەرمان پێ‌کردن )

لێرەدا دەتوانین ووشەی ( مۆرشف ) واتە ئەرشیفکار

لەسەر کێشی ( مؤرخ ) وەربگرین بۆ دیاری کردنی ئەو کەسەی لە ئەرشیفدا کار دەکات ئەمەیش بە ئنگلیزی بە ووشەی Archivist دەردەبڕێت .

ئێمە هەرگیز ئارەزووی بەکار هێنانی زاراوەی بێگانە ناکەین و حەزی پێ ناکەین ، ئەگەر چی زمانە تەشەنگەکەمان ووشەو واتای زۆری تێدایە ، ئەوا خۆمان ناچار دەبینین لە بەکارهێنانی ووشەی ( ئەرشیف )دا داوای لێبووردن بکەین ، بەوەی کە ووشەیەکی ووشە نوێیەکانی شارستانییە ، ئەویش وەکوو ئەو دان ووشانەی کە شارستانیەتی هاوچەرخ بەسەریدا سەپاندووین و هاتوونەتە ناو زمانەکەمانەوە وەکوو : فەلسەفە ، جوگرافیا ، تەلەفزیۆن ، رادیۆ ، تەلیفۆن ، مایکرۆفیلم ، سینەما ، کابلۆ ، لە دوایشدا ( ئەرشیف ) کە لە نێو ووشەو زاراوەکاندا ووشەیەکمان بەرانبەر نەدۆزییەوە وامان بە باش زانی جارێك لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە بەکاری بهێنین :

١ ـ لەبەر ئەوەی لە بواری جیهانیدا باووبلاوە .

٢ ـ لەبەر واتای زاراوەیی و زمانەوانیی ووردو دەربڕی .

٣ ـ لەبەر ئەوەی درەنگ چووینەتە مەیدانی لێکۆلینەوەو رێکخستنی بەلگەنامەو ئەرشیفەوە لە چاو دەولەتە پێشکەوتووەکانی تری ئەم بوارەدا .

٤ ـ لە دوایشدا چونکە زۆربەی سەرچاوەو چاووگەکان ئەوانەی لەم زانستە نوێیە دەکۆلنەوە بە زمانە جیهانیەکانی وەك فەرەنسی و ئنگلیزی و ئەلەمانی و ئیتالی و ئەسپانی و هی تر نووسراون و تۆمار کراون ، ئەوەیش بە زمانی عەرەبی نووسرابێت دیارە دەگمەن و کەمە ، لەبەر ئەمەیە ناچارین ئەم ووشەیە بەکار بهێنین ، بۆ ئەوەی بکەینە کاروان و ئەوەی لە رابوردوودا لەدەستمان چووە دەستەبەری بکەینەوە .

## بەشی دووەم
## مێژووی ئەرشیف

### لە سەردەمە کۆنەکاندا :

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانرێت بووترێت کە ئەرشیف لە شارستانیی رۆژهەلاتی کۆندا هەبووەو زانراوە هەروەها لەلای گریك و رۆمانەکانیش . لە مێژوودا زانراوە کە وولاتی میسۆپۆتامیا یەکەمین شوێنی نووسین و تۆمارکردن بووە . ئەوەبوو عیراقییە کۆنەکان نووسینی بە وێنەیان داهێنا واتە Pictographic ئەویش لە بەشی دووەمی سەردەمی وەرکاء ( ئوروك )دا نزیکەی ٣٥٠٠ پ.ز ، زانیاری و زانستەکانیان لەسەر قوڕو بەرد تۆمار کردووەو ، لە عیراقەوە ووشەی نووسراو بە ناوچەکانی تری رۆژهەلاتی کۆندا بلاوبووەوەو بەکار هێنرا .

عیراقییە کۆنەکانی وەکوو سۆمەری و ئەکەدی و بابلی و ئاشووری و کلدانییەکان ئەرشیفیان زانیوە هەروەها میسرییە دێرین و مادەکان و فارس و نەتەوەکانی تریش زانیویانەو لە تواناداییە ئەو خشتە قوڕو تەلەبەردو نووسراوانەی تر کە بەجێیان هێشتووە ، بە مادەی سروشت و ئەرشیفی دابنرێن .

ئەوسا کەرەستەکانی ئەرشیف هەروەها کەرەستەکانی کتێبخانە زۆر جار لەیەك جێگادا دەپارێزران، ئەگەرچی ئەوە پەرستگا یان کۆشکی پادشایان یان جێگای تر بووایە ، لە چەرخە کۆنەکانیشدا شارستانیەتەکانی سەرەتا جیاوازییان لە نێوان کتێب و بەلگەنامەدا نەدەکرد ، بە ووشەیەکی تر جیاوازییان لە نێوان سەرچاوەو Sources لە نێوان چەشنەکان و شێوازەکانی بەلگەنامەیی (التوثیق) Documentation نەدەکرد(٣)

ئەوەبوو سۆمەری و ئەکەدی و بابلی و ئاشووری و حەیسی و میسرییە کۆنەکان ، لەبەر چەند هۆیەکی بەڕێوەبردن ئەرشیف و کتێبخانەیان تێکەلی یەك دی دەکرد ، لەسەر ئەم بناغەیەیش ئەو ئەستۆرانەی ( کۆگ ـ عەمبار ) کە هەموو چەشنە شتومەکی ئەرشیفیان تێدا بووە کە لە سەدەی رابوردوودا پشکنینی شوێنەوارەکان، لە ژمارەیەك لە شارە کۆنەکانی عیراقدا ، پەردەیان لەسەر لادان ، زانایانی شوێنەوارو مێژووناسەکان بە گەنجینەی ( ئەمباری ) کتێبیان دانان وەکوو کتێبخانەی ئاشوور بانیپال لە نەینەوا ، بەلام لە راستیدا شتەکە پێچەوانەی ئەوەیە ، ئەم ئەمبارانە لەوەوە نزیکن کە ئەرشیف بووبن بە بەلگەی شتومەکە ئەرشیفیەکان کە بەشی گەورەی پێك دەهێنن ، ئەوانە کتێبخانە نین بەلکوو ئەمباری بەلگەنامەکانن ( ئەرشیف ) وەکوو ئەرشیفی شارە کۆنەکانی عیراق لە: نیفر ، درێهم ، نەینەوا ـ واتە کتێبخانەی ئاشوور بانیپال ـ ، ئەدب ( بسمایە ) سەبیار ( ابو حبە ) ، بابل ، کیش ، تەللو ، وەرکاء ، ئەرووك ) ، تەل حرمل ( شادبوو ) ، ئاشوور ، نووزی ( ترکلان ) ، تیسفوون ( مەداین ) و ئەنباری کۆنی تری کتێب لە عیراقدا .

**له سەردەمی گریکەکاندا :**

هیچ بەڵگەیەك نی‌یە كە گریکە کۆنەکان ئەرشیفیان هەبووبێت . چونکە ووشەی ( بلیوتیکە Biblioteke) ی گریکی کە ( بلیوتیکا )ی لاتینی بەرانبەرە بریتی بوو لە ئەمبار بۆ پاراستنی سامانو شتومەك كە ئەمڕۆ پێ‌یان دەڵێین ( شتومەکی ئەرشیفی ) . تاقە ئەرشفێکی ڕێكو پێك کە تێکستی یاساکانی تێدا دەپاراست . ئیفیالتسی سەرهەڵداو سیاسی زانی ئەثینایی لە دەوروبەری سالی ٤٦٠ پ . ز دا دای‌مەزراندبوو ، سەدەیەك بەسەر ئەوەدا تێ نەپەڕی، تا وای لێ هات هەموو ئەمبارەکانی دۆسیەکان لە ئەسینا یەك خرانو لەیەك جێگادا کۆ کرانەوە ئەویش لە پەرستگای تەرخانکراو بۆ پاراستنی دایکی خودایان کە بە ناوی ( میترۆن ) دەناسرێت .

هەڵبژاردنی پەرستگا بۆ جێگای پاراستن ، دوو چاکی تێدایە : لە لایەکەوە شوێنێکی ئەمینە ، لە لایەکی ترەوە پیرۆزە . بەڵام سەردەمی جیاکردنەوەی شتومەکی ئەرشیفیو شتومەکی کتێبخانە بۆ سەدەی بازدەهەمی زایینی و، ئەو پەرەسەندنە هونەری‌یانەی بواری چاپەمەنی دەگەڕێتەوە .

ئەوسا یاساکان لە ( میترۆن )دا دەپارێزرانو بڕیارو مەرسوومو ڕاپۆرتی تایبەت بە کۆبوونەوەکان لە ئەنجوومەنی پیرانو ئەنجوومەنی گشتی‌دا دەپارێزرانو ، بڕیارەکانی دادگاکانی ( جنائی )و ، قەیدەکانی دارایی‌و نوسخەی بڕیارەکانیش لە دەستەی بالای (قضائی)ی دەوڵەت وەردەگیران. بەڵام ئەو بەڵگەنامانەی شێوە ناتاسایی کەسایەتییان هەبوو ، لە جێگایەکی تایبەتی‌ی خۆیان دەپارێزران .

رەنگە شارەکانی تریش ، ئەگەرچی لێیشی دڵنیا نین . ئەرشیفی تایبەتی‌ی خۆیان هەبووبێت . میحرابی پیرۆزیش لە پەرستگای « دلفی » ئەرشیفی بڕیارە کۆنەکانی تێدا بوو ، بنەڕەت یان گەلالەی بەڵگەنامەکان لە ئەرشیفدا دەپارێزران . بەڵام نوسخەی گشتی Version و بڕیارە بلاوکراوەکان یان ئەوانەی دەربارەی مەسەلە ئاسایی‌یەکان رەش دەکرانەوە ئەوا لە چەشنی ( نوسخە )دا دەردەچوون ، هەڵەیشە ئەگەر وا بزانرێت کە پەرستگایان جێگا گشتی‌یەکان کە بۆ پێ‌سپاردنی ئەم جۆرە مەسەلانە تەرخان کرابوون بە ئەرشیف دانرێن .

ئەو داموده‌زگایانەی سەر بە دەوڵەت بوونو تۆمارەکانی خۆیان دەپاراست ، زۆر جار ئەو شتانەیان دەگوێزرایەوە ئەرشیف . بەڵام بۆ مەبەستی بەکارهێنانی ڕەسمی دەتوانرا دانە ئەسڵی‌یەکە جارێکی تر وەربگیرێتەوە ، هەروەها هاوولاتییان دەیان توانی چەند نوسخەیەکی لێ وەربگرن . بەڵام بەرپرسیاری ڕەسمی‌ی پاراستنو سەرپەرشتی کردنی ئەرشیف لە هەموو کاتێکدا بە جۆرەها مووچەخۆر دەسپێررا ، بەڵام نیشی بنەڕەت لە ئەستۆی دەستەیەك بوو کە لە ئەمیندارەکانی بەڵگەنامەکان پێك هاتبوون واتە ئەرشیفیستو نوسەرەکان .

**لە سەردەمی ڕۆمانەکاندا :**

ئەو شتانەی سەبارەت بە بەڕێوەبردنو کاروباری ئەرشیف لە سەردەمی ڕۆمانەکاندا لەبەر دەستماندان لە هی گریکەکان زۆرترنو ئاشکراترن ، ئەوەبوو لە سەردەمە کۆنەکاندا بەڵگەنامەو دۆسێکان لە کۆشکی شادا ، ئەنجا لە سالی بالیۆزەکاندا ، دەپارێزران . کە سەدەی پێنجی پێش زایین هات ، لەبەر هەندێك هۆی سەلامەتو هێمنی ئەو بەڵگەنامەو دۆسێیانە گوێزرانەوە خانووو بەرەی گشتی .

یەکە ئەرشیف ئەوە بوو کە سیاسەتکاری بەناوبانگی ڕۆمان (ڤالیریۆس پۆبلیکۆلا) لە دەوروبەری سالی ٥٠٩ پ . ز دا دای‌مەزراند ، شوێنەکەیشی لە ( ئیراریۆم ) یان گەنجینەی ناو پەرستگای خودای ( زومەی‌ساتێرن )دا بوو کە خودای کشتوکالی ڕۆمانەکانە . لەم شوێنەدا یاساو مەرسوومەکان (decrees) و پەیڕەوەکانی (acts) ئەنجوومەنی پیران ( یان پەرلەمان )و قەبالە ( مستندات )ی ئەو ناوچانەی سەر بە پیران هەروەها موعامەلاتو قەیدنامە دارایی‌یەکان دەپارێزران . بەڵام بەڵگەنامە دەوڵەتی‌یەکان ــ واتە ئەوانەی پەیوەندی‌یان بە دەوڵەتە بێگانەکانەوە هەیە ــ لە (کاپیتۆل)دا دەپارێزران .

چەند ژمارەیەکی ئەرشیف لە ڕۆمادا هەبوون ، بگرە لە سەردەمی کۆماریش‌داکەوا لە ژێر چاودێری‌ی مووچەخۆری پلەو پایە جیاوازدا بوون . بەڵام لە سەردەمی ئەمپراتۆریەت‌دا خانوویەك دروست کرا بەناوی خانووی بەڵگەنامەکانی قەیراڵ دەناسرا یان ئەرشیفی ئەمپراتۆر کە نەك هەر هەموو کاغەزەکانی ئەمپراتۆر خۆی تێدا دەپارێزرا ، بەڵکو هەموو ( گەواهنامە ــ مستمسك )و ( قەبالە ــ مستند )ە ڕەسمی‌یە ــ کانیش . ئەم ئەرشیفانەیش لە دوادوایی سەردەمی ئەمپراتۆریەت

...سەر ... بوون . سەرەڕای ئەرشیفەکانی شارەوانی کە یاساو ڕژێمە تایبەتی یەکانی ئەنجومەکانی شارەوانییان تێ دەخرا ، هەروەها ئەیدنامەو دۆستی دارایەکان و بڕوانامەی لەدایك بوون و مەسەلەکانی منداڵ ڕاگرتن ( التبنی )و سامان و موڵك و ماڵ و ئەو مەسەلانەی لەم جۆرەن و پەیوەندییان بە تاکە کەسانەوە هەیە . (٤) .

بەلام ئەرشیفی ناوچەکان ، سەرەڕای بەلگەنامەی ئاسایی بەڕێوەبەرایەتی ، هەموو بەلگەنامەو ( گەواهنامە ـ مستمسك )و سەنەدی تایبەت بە زەوی و زارو سەرژمێری ی دانیشتووان و ڕێککەوتننامەو لەدایك بوونی تێدا بوو . هەروەها لە هەر ئۆردوگایەك لە ئۆردوگاکانی ڕۆماندا ئەرشیفێکی سوپایی هەبوو . هەروەها ئامۆزگا ئایینییەکانیش (٥) هەر یەکەی ئەرشیفێکی تایبەت بەخۆی هەبوو.

ئەوەندەی ئەبرد چاودێری و سەرپەرشتی کردنی ئەرشیف لە کۆتایی سەردەمی ڕۆمانەکاندا نزم بووەوە تا وای لێهات بەرەو پلەیەکی خراپ چوو ئەوەبوو ئەمپراتۆرەکانی ڕۆمان زۆریان بایەخ بە چاودێری کردن و پاراستنی بەلگەنامە گشتی یەکان دا ، ئەوەبوو یاساکەی جستنیانی یەکەم (٥٢٩ ز) جێگایەکی تایبەتی بۆ تەرخان کرا بۆ ئەوەی لە ئەرشیفدا بپارێزرێت و چەند ئەرشیفستێکی بۆ دامەزرێنرا ، ئەرشیمەکانیش لە لایەن چەند مووچە خۆرێکی کارامەو چەند ... سەرێکەوە بەڕێوە دەبران ، کە بە پێی زنجیرەی کات ( کرۆنۆلۆژی ) ڕێك دەخران و سیستەمی ژمارەی تایبەت بە خۆیان هەبوو ، بۆ ئاسان کردنی ئەرك و هەوڵی توێژینەوەو ئەو کەسانەی سەر لەو شوێنانە دەدەن بۆ ئەوەی چەند دانەیەکی مۆرکراوو باوەڕ پێکراوی ( قەبالە ـ مستمسك )و بەلگەنامەکانیان چنگ بکەوێت .

ئەمپراتۆر مەکسیملیانی یەکەمیش ( ١٤٩٣ ـ ١٥١٩ ) هەوڵی دا ئەرشیفێکی ناوەندی بۆ ئەمپراتۆریەتی پیرۆزی ڕۆمان دابمەزرێنێت . بەلام لەم بوارەدا سەرکەوتنی وەچنگ نەخست .

**لە سەردەمەکانی ناوەڕاستدا :**

دەبینین شێوەی کۆنینەی پاراستنی بەلگەنامەو شتە گرنگەکانی تر لە پەرستگاکاندا ، لە سەردەمەکانی ناوەڕاستدا دووبارە دەبێتەوە کاتێك کە دۆسیێکانی سەر بە دەستەلاتە شاری یەکان لە ( دێر )ەکاندا دەپارێزران .

لە کۆنیشدا ئەمپراتۆرەکانی ڕۆمان بڕیارەکانی خۆیان لە کۆشك و پەرستگاکانیاندا دەپاراست . بەلام لە سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا کاتێك دەستەلاتەکان زۆر بوون و ( امتیاز )ی جۆراوجۆرو دەرەبەگایەتی سەریان هەلدا ، هەر لایەك دەستەلاتی هەبووایە ئەرشیفی تایبەت بە خۆی دەبوو ، ماف و امتیازەکانی خۆی نیشان دەدا . ئەم جۆرە ئەرشیفەوە نەبوو کە پادشا خۆی ئەرشیفەوە نەبوو کە پادشا خۆی هەیبوو . لەوانەیە گرنگترین کەلەپوورێك کە بۆ ئەورووپا لە سەردەمەکانی ناوەڕاستدا بەجێ مابێت بەلگەنامەکانی کلیسا بێت کە لەو سەردەمانەدا کلیساکان لە بێنەو بەردەی جەنگ و لە تالان کردن بە دوور بوون . (٦)

لە ووڵاتانی ڕۆژئاوادا ئەرشیفەکانی قەشەو پاپاکان لە دێرو کلیسای مەسیحی یەکاندا پردێك پێك دەهێنین سەردەمە کۆنەکان بە سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەبەستن ، ئەویش لە چوارچێوەی بەردەوامی ی کاری ئەرشیفی ی دەوڵەتی بیزەنتییەکاندا کە ڕۆژگارەکە مەیلەو هێمنی و ئاسایش دەڕۆیشت ، بۆیە جۆرە بەردەوامی یەك لە ڕێکخستنی ڕۆمەکاندا هەبوو ، بە پێچەوانەی لایەکانی ئەمپراتۆریەتی ڕۆژئاوای ڕۆمانی کەوا دەرباری فەرمانڕەواکان لە جێگەیەکەوە دەچوو بۆ جێگەیەکی تر ئەمەیش وای کرد کاروباری ڕێکخستن کارێکی گران بێت .

دەشتوانرێت بووترێت کە پادشاکانی ئەورووپا دوو جۆرە ئەرشیفیان هەبوو :

١ ـ ئەرشیفی چەسپاو .
Stataria

٢ ـ ئەرشیفی گەڕۆك .
Viatoria

ئەمانەیش هەر لە سەدەی دوازدەهەمەوە هەبوون .

ئەرشیفی گەڕۆکیش هەمیشە تووشی مەترسی دەبێت و دیارە بچووکیشە چونکە کەمترین بەلگەنامەی گرنگ و چاکی تێدا دەبێت . مێژوویش بۆمانی دەگێڕێتەوە کە فیلیب ئۆگستوس شای فەرەنسا لە ساڵی ١١٩٤ ز دا لە جەنگەکانی لەگەل ریکاردۆس ( ریتشارد ) شێر دڵدا زۆر لە

بەلگەنامەکانی لەدەســـت چـووە ئەمەیش بۆ دەســـتو پێوەندەکانی پالپێوەنەرێك بوو هەر بەلگەنامـەو رێککەوتننامەیەك بـووە روونووسی بکەنەوە ، هـەمووشیان خستووەتە نێـــو سندووقەوەو لە خانوویەکی تایبـــەتیدا پاراستوویانە کـــە سەرچاوەی هـــەموو خەزنـــەی بەلگەنامەکانە کـــە بارەگای لـــە ( لۆڤەر )دا بوو ئەنجا دوای ئەوە لە سەردەمی لویسی نۆیەمدا ( ١٢١٤ـ ١٢٧٠ ) گوێزرایەوە ( سانت چاپل دوپالاس ) ، بۆ نیشاندانی شوێنی ئـــەم ئـەرشیفەو بایـــەخی لای پادشایان ، کـــــە شوێنێکی وەك ئەستۆر بووە بۆ ئەو بەلگـەنامانەی مافی پادشا دەپارێزن ئەوەیە کـــە شارلی پێنجەم وتوویەتی :

« ئەو شانازییەکی زۆر بــــەم گەنجینەوە دەکات پتر لـــە شانازی کردنی بەو گەنجینانەی کـــە پارەو خشلی تێدا دەپارێزێتو هــــەڵ دەگرێت ، لـــەم گەنجینـــــەیدا ( امتیـــاز )ەکانی خۆی دەپارێزێتو بەویش مافەکانی تاج دەپارێزێت ».

هەموو پادشاکان هەوڵی ئەوەیان داوە لەم گەنجینەدا هـــــەموو ئەو شتانە بپارێزن کـــــە پشتگیریی مافەکانیان دەکـــەنو تـــەختی پاشایەتییان دەچەسپێنن ، هـەموو بەلگەنامەیەکیان تێـــدا دەپاراست هەر جۆرە مافێکی بچەسپاندبا . لە سالی ١٦٢٦ دا شـــارل بڕیارێکی دەرکـــرد کـــــە . . هـــەموو رێککەوتننامەیەك یـــان یادداشتێك یان پاسانامەیەك یـــان رێنوێنییەك پەیوەندیی بـــە مافەکانی تـــاجو دەستەلاتییەوە هەبوو بێت بخرێنە نێو ئەم ئەرشیفەوە .

دەستە شارییە ( ناڤاینیەکان )، هەر لە سەرەتای سەدەی یازدەهەمو دوازدەهەمی زایینیو لە پاشیشدا، پەنایان بردە بەر ئەوەی کاغـــەزو بەلگەنامەکانیان لـــە ئەرشیفەکانی کلیـــساکاندا بپارێزن ، ئەوەی لە ئەو بەلگەنامانە ماوەتەوە ژمـــارەیەکی زۆر پێك دەهێنێت پێش ئـــەوەی ئەستۆر ( ئەمبـــار )ی بەلگەنامەکان دابمەزرێن ســــەرەڕای ئـــەوەی ئەرشیفی لاوەکی هەبووەو لێـــرەو لەوێ بووە .

لـــەو شتانەی گومانیـــان لێ دەکرێت ئەوەیە کە ئیشارەت یـــان بەلگە هەبوو بێت ئەوە بچەسپێنێت کـــە لە سەدەی چـــوارەمی پێش زایینیدا ئەرشیف دامـــەزرابێت ، بەلام هیچ گومانێك لەوەدا نییە ئەم ئەرشیفە لە ناوەڕاستی ســـەدەی شەشەمدا هــــەبوو بێت . « پۆلی پێنجەم ( Paul V ) یش بـــە (Panl

دامەزرێنەری ئەرشیفی ڤاتیکـــان دادەنرێت ئەویش لـــە سەرەتای سالانی سەدەی حـــەڤدەهەمدا . ئەمەیش ئەوە دوور ناخەنەوە کـــە چـــەند ئەرشیفێك لە چـــەند ژمارەیەکی کلیساکاندا هـەبوو بێت بۆ ســـەدەی هەشتەمو نۆیـەمی زایینی بگەڕێنەوە .

ئەوەبوو لـــە هـــەریەکە لە فەرەنسـاو ئیتالیادا لەســـەر رژێمی بەلگەنامەو ئەرشـــیفە شارییەکان رۆیشتن کە بە

(Gesta Municipalla) دەناسرێتو کـــە لە ئەمپراتۆریەتی رۆماندا تاوەکوو سەدەی نۆیـەمو دەیـــەمی زایینی باو بووە بـــەلام بەناوی ( ئـــــەرشیڤۆم کیوریا ـ (Archivum Curiae- واتـــە بەلگەنامەکانی دایـــرەی پاپ .

(١) بۆ زانینی ئـــەوەی دەربارەی وشەی ئەرشیـــف نووسراوە بڕوانە ئەم سەرچاوانە :

ئینسکلۆپیدیای بریتانیـــــا ( E.B. ) . ئینسکلۆپیدیـــای جیهانی ( E.I ) و هی تر .

(١) بڕوانە ئنسکلۆپیدیای جیهـــانی E. I ماددەی ئەرشیف Archives

* تێبینیی وەرگێڕ : ئەمە لـەچاو داڕشتـــنو بەکارهێنانـــی وشـەکە لە زمانی عەرەبیدا .

(٣) بڕوانە بابەتی : archives لە هەردوو بە شی E . I و E . B . دا .

(٤) بڕوانـــــە ئینسکلۆپیدیای بریتانی E.B. باسی ئەرشیف .

(٥) Priestly College

(٦) الوثائق التاريخية ـ مامۆستا محمد احمـــــد حسين القاهرة ـ ١٩٥٤ ل ١

# بەرەوپێشکەوتن

## کۆشکی رۆشنبیری وهونەر

لە٧ی مانگی نیسانی رابوردوو لەئاهەنگێکی تایبەتیدا لە شاری بەغدا کۆشکی رۆشنبیری هونەر [ قصر الثقافة والفنون ] کرایەوە . ئەم کۆشکە شوێنەوارێکی کۆن و دێرینە و رۆژ گارێکی دوورو درێژی بە خۆیەوە دیوە . ئێستاش وا قەیار کراوەتەوە کە لە زۆر لاوە سودی لێ وەربگیرێ .

### مێژووی کۆشکی رۆشنبیری‌و هونەر

- ئە م خانووە کاتی خۆی بۆ (ام حبیب)ی کچی هاروونە رەشید دروست کراوە .
- لە سەردەمی والی یوسف پاشادا (سالی ١٠٣٠–١٠٣٢ ای کۆچی) کراوە بە عەماری چەك وتفاق .
- لە شکری شا عباس لە سالی ١٠٣٣ ی کۆچی سوتاندویانەو کاولیان کردوە .
- سالی ١١٧٦ ای کۆچی – ١٧٦٢ ی زایین کە سەردەمی حوکمڕانی والی علی پاشا بوو شوێنی ئەم کۆشکە کرا بەقوتابخانەی زانستی والە ( المدرسة العلمیة ) .
- دوای سەد سال لە سەردەمی والی مدحت پاشادا (١٨٦٩–١٨٧٢ی زایین) کرا بە قوتابخانە [ الصنایع ] وبەشی چاپخانەی رۆژنامەی – الزوراء –ی خرایە سەر . ئەمەش کۆنترین رۆژنامەیە کە لەبەغدا دەر چووە .
- سالی ١٨٧١ی زایین دەست کرا بەدەرس خوێندن تێیدا .
- سالی ١٨٩٩ی زایین ، کە سەردەمی والی نامیق پاشا بوو ، مۆسیقاش وەك دەرسێك کرا بە کەرەسەی خوێندن لەم قوتابخانەیەدا . تاوەکو هەلگیرسانی ئاگری شەڕی یەکەمی جیهان دەرس لەم قوتابخانەیەدا خوێنراوە .
- دوای ئەوەی ئینگلیزەکان بەغدا یان داگیرکرد کرا بە وەرشەی چاککردنی ئوتوموبیل .
- دوای ئەوەی لافاو هەستاو بەغدای گرتەوە و دەرباری پاشایەتی ( البلاط الملکی ) لەناودا نقوم بوو .. حکومەت سالی ١٩٢٩ی زایین ئەم کۆشکەی قەیار کردەوە و کرا بە مالی مەلیك و ئەوەبوو مەلیك فەیسەلی یەکەم و خێزانەکەی و ماوەیەکیش مەلیك غازی‌و بنەمالەکەی تێدابوون .
- سالی ١٩٣٨ دوای ئەوەی سەر لەنوێ دەستێکی پێداهێنرا کرا بە بارەگای ئەنجومەنی نەتەوە ( مجلس الامة ) .
- دوای شۆرشی ١٤ای تەموزی سالی ١٩٥٨ کرا بە بارەگای دادگای تایبەتی سوپا .
- لە سالی ١٩٦٧ – ١٩٧٢ وەزارەتی بەرگری کردی بە مۆزەخانەی سوپایی .
- حکومەتی کۆماری عیراق سالی ١٩٧٧ بڕیاریدا بیکات بە کۆشکی رۆشنبیری و هونەر و دەست کرا بە قەیارو نوێ کردنەوەی .
- لە نیسانی ١٩٨٠ دا لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندنەوە بەناوی کۆشکی روشنبیری‌و هونەرەوە خرایەکار .

### لە کتێبخانەی کوردیدا

لەم ماوەی دواییەدا چەند بەرهەمێکی نوێ چوونە ریزی کتێبەکانی کتێبخانەی کوردی‌یەوە ، لێرەدا بە کورتی باسیان دەکەین :

١ – هەندێ ئامرازی سینتاکس لە زمانی ئەدەبی ئەمرۆی کوردیدا .

لە چاپکراوەکانی ئەمینداریەتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان ، بەرهەمێکی زمانەوانی بە ناونیشانی ( هەندێ ئامرازی سینتاکسی لە زمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیدا ) لە نووسینی دکتۆر ابراهیم عزیز ابراهیم کەوتە بازارەوە ، کتێبەکە لە ٩٦ لاپەڕەی قەوارە گەورەدایە. شایانی باسیشە ئەمە یازدەهەمین کتێبی چاپکراوی ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری‌و لاوانە .

٢ – ئاوازو گۆرانی‌ی کوردی :

دیسان لە بلاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی ؛ کتێبێکی تازەی کاك محمود زامدار بە ناونیشانی ( دەروازەیەك بۆ ئاوازو گۆرانی‌ی کوردی ) کەوتە بەردەستی خوێنەرانی کورد زمان ، کتێبەکە بریتی‌یە لە باسێکی درێژو چەندین سەرنج دەربارەی گۆرانی‌و ئاوازی کوردی ، سەرەڕای گیرو گرفتەکانی گۆرانی‌ی کوردی ، ئەم کتێبە بەسەر شازدە بەشدا دابەش‌کراوەو هەر بەشێکی ناونیشانێکی سەربەخۆی هەیەو لە باسێك دەدوێت .

### کتێبێکی نوێ بە ئەلەمانی دەربارەی ئیبن سینا

بەبۆنەی یۆبیلی هەزار سالەی ئیبن سیناوە دەزگای بلاوکردنەوەی (ب.ج توبنەر) لە لایپزیك

ـ کۆماری دیموکراتی ئەڵمانیا ـ لەژێر ناونیشانی « ژیانی پزیشك و ئەکتەلۆجیست و فیزیکی ناودار ییبن سینا » کتێبێکی بڵاو کردەوە . ئەم بەرهەمە زانای ئەرکیلۆژی بو خارد برنجس و کچەکەی کە مامۆستای فیزیکە سونیا برنجس بەدوو قۆڵی نووسیویانە و باسی ئەو فەیلوسوف و زانایەی بوخارا دەکات .

وەك زانراوە ئەمساڵ لە سەمەر قەند و تاشقەند و مۆسکۆو چەند شارێکی تری سۆڤێتی دا بەبۆنەی تێپەڕ بوونی هەزار ساڵ بەسەر لەدایك بوونی ئیبن سینای فەیلەسوفدا کە لە گوندێکی بوخارا لەدایك‌بووە ، فیستیڤاڵ و کۆڕ وسیمیناری زانستی و ئەدەبی رێك دەخرێ .

ئیبن سینا کە لە جیهانی لاتینی دا بە «ئەڤیسینا» ناسراوە کتێبێکی هەیە بەناوی « باسای پزیشکی ـ قانون الطب » ئەم بەرهەمە تاوەکو سەدەی حەڤدە لەسەرانسەری ئەورووپا ناسرابوو .

کتێبەکەی پرۆفیسور برنجس لەچوارچێوەی مێژووی ئیسلامی دا تیشك دەخاتە سەر پێشەکی‌یە ماددی‌و بیری‌یەکانی ئەو رابەرینە فەلسەفی و زانستی‌یەی کە لەئارادا بوون لەکاتێکدا کە تاریکی و باشکەوتوویی باڵیان بەسەر ئەورووپای مەسیحی دا کێشابوو .. تەنانەت لەدێرەکانیش‌دا بیر هەرەسی هێنابوو ..

هەردوو نووسەرەکە دەڵێن : ئیبن سینا توانیویەتی سوود لەباشترین نووسینەکانی فەیلەسوف و سروشت ناسەکانی یۆنان وەرگرێ بەتایبەتی ئەرستۆ کە بەرهەمەکانی لە یۆنانی‌یەوە وەرگێڕ درابوون .

ئیبن سینا بەدەستی خۆی کورتەیەکی ژیانی خۆی نووسیوەو لەم کتێبەدا کراوە بە ئەڵمانی . ئەم فەیلەسوفە پزیشکێکی ناسراوی سەردەمی خۆی بووەو لە دەرباری زوربەی میرەکانی ناوەراستی ئاسیادا کاری کردوە . لەدواییدا سەری لە ئێران داوە . هەروەکو بۆی دەچن لەتەمەنی پەنجاو هەشت ساڵیدا لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووە .

هەردوو نووسەرەکە جۆرێك لە ماددی‌یەت لە فەلسەفەی ییبن سینادا دەبینن بەتایبەتی کە باوەڕی بە نەمری جیهان هەبووە نەك بە نەمری‌ی گیانی خۆیەکی . تاقی کردنەوەی بە پێوەرێکی بن بڕی واقیع دادەناو بە هۆی بیرە فیزیاییەکانیەوە بە پێشرەوی نیوتن دادەنرێت . بیروڕاکانی دەربارەی دامەزرانی چیاو شاخ‌و دەربەند و دۆڵەکیان بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاریان لە (لابل) ی دامەزرێنەری جیۆلۆجی نوێ کردووە .

لە کتێبی « باسای پزیشکی‌دا ـ قانون الطب » ییبن سینا چەند ئامۆژگاری‌یەك دەکات کە تائێستا سودیان ماوە بەتایبەتی دەربارەی رێ‌وشوێنی خۆراك خواردن ولەم بوارەدا بایەخێکی زۆر بە مەسەلەی پاراستنی تەندروستی منداڵ و ژنی سك‌پڕ دەدات . سەرەڕای ئەمانە کتێبەکە بیروڕای ییبن سینای تێدایە لەبارەی زانست و زانینە کانەوە و ئەم رایانەش لەتوێکردنەوەی رادەی زانینی مرۆڤی خوێندەوار و وەك لقێکی بنەرەتی‌ی لە رۆشنبیری مرۆڤایەتی جیهاندا سودیان بەخشیوە .

## بۆکار .. ئۆتومبێلێکی نوێ‌یی

ماوەیەکە دروستکەرانی ئۆتومبیل نیازی ئەوەیان هەیە ئۆتومبێلێکی بچووك دروست‌بکەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەنگ‌و چەڵەمەی قەرەباڵغی لە رادەبەدەر کە شەقامی شارە گەورەکان بە خۆیانەوە دەیبینن .

لەو ئۆتومبێلانەش ، ئۆتومبێلێکی بچووکە ، کە پێشانگای ئۆتومبێلی ( تۆرینۆی نێو دەوڵەتان ) لە ئیتالیا پێشاندراوە .

ئەم ئۆتومبێلە بچووکە چوار کەسیش دەگرێت لەگەڵ شت‌و مەکەکانیان‌داو ، مەکینەکەشی زۆر بەهێزەو سووتەمەنی‌ی کەم پێویست دەکات .

درێژایی ئەم ئۆتومبێلە ٢,٨٠ مەترەو وا چاوەڕوان دەکرێت لە کۆتایی ئەم ساڵدا بۆ فرۆشتن بخرێتە بازارەوە .

## داوودەرمانی هێمن‌کەرەوە لەوانەیە کاریگەری‌ی حەبی سك‌پڕنەبوون لەکاربخات

لێکۆڵینەوە زانستی‌یەکان چەسپاندوویانە کە بەکارهێنانی داوودەرمانی هێمن‌کەرەوەو حەبی نووستن‌و رۆن‌و چەوری وەك رۆنی برافین دەبنە هۆی لەکارخستنی کاریگەری‌ی حەبی سك‌پڕنەبون ، ئەو ئافرەتەی ئەمانە بەکاربهێنێت لەگەڵ ئەوەشدا کە حەبی سك‌پڕنەبوونی بەکارهێنابێت کچی سکی هەرپڕ دەبێت .

هەروەها دووپاتی ئەوەشیان کردووەتەوە ئەو نەخۆشەی کە پتر لە یەك دەرمان لە یەك کاتدا بەکاردەهێنێت دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو ئەنجامە چاوەڕوانکراوەی ئەو دەرمانە بەدەست‌نەهێنێت .

لەسەر ئەم بناغەیەوە ئەوەبوو رێکخراوی تەندروستی‌ی نێودەوڵەتان لەم دواییەدا داخوازی‌و بانگەوازی بڵاوکردووەتەوە بۆ رێ‌پێشاندانی

بەکارهێنانی داوودەرمانو بەکارهێنانی بە چاودێری کردنێکی ووردی پزیشك نەبێت .

## هەواڵێکی زانستی

ئەم دوایی‌یەدا زاناکان ئامێرێکیان دروستکردووە زۆر ووردو هەستدارە دەتوانێت ئاگاداری جوولانەوەی توێکلی زەوی بێت لە لایەنی بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەوە ئەگەرچی پێنج ئینجیش بوو بێت ئەوەیش لە مەودای سی میلدا .

ئەم ئامێرە بە هۆی ناردنی چەپکێك تیشکەوە ئیش دەکات .

## بەرخێکی‌سەیر

لەم دوایی‌یەدا ـ لە گوندی ( جۆلەمێرگ )ی سەر بە ناحیەی خلێفان لە پارێزەگای هەولێر بەرخێکی بچووکی سەیر لەدایك‌بووە کە سێ قاچی هەیە بەڵام ئەو قاچەکەی تری بریتی‌یە لە ١٥ سەنتیمەتر بێ‌ئەوەی ئێسقانی تێدابێت .

## زەنگەکانی شانۆی بۆلشەوی

نزیکەی ٥٠ ساڵ دەبێ قوللەی ئەو زەنگانەی کە ئەلێکسی کو ساکین دروستی کردوە خزمەتی شانۆی بۆلشەوی دەکات ، قوللەی زەنگەکان لەقاتی شەشەمەو ٣٦ زەنگی تێدایە کە گەورە کەیان ٢٠٠ کیلو فورسە ( هەربودێك ١٦ر٣٨ کیلو گرامە ) .

ئایا ڕاوە شاندنی زەنگێك کەفورسا یەکەی ٢٠٠ کیلۆ بێت ئاسانە ! لێرەوە ئەم مەسەلەیە پێویستی بە قسەلێ کردن هەیە . فالێری دیشر کە لە شانۆی بۆلشەوی زەنگەکان لێ دەدات پێشنیاری کردوە ئەم کارە میکانیزە بکرێ چونکە بەبێ ئورکێسترا لێدانی زەنگەکان هەروا ئاسان نی‌یە . نورسێریش ئەوەیە کە دەنگی لەرینەوەی زەنگەکان لەگەڵ ئۆرکێسترا ئاوازێك پێك بهێنێ . چونکە پێویستە ئەو کاتە لەبەر چاو بگیرێ کە دەنگە کە بڕینی ٤٠ مەتر تا دەگاتە هۆڵی جەماوەر پێی دەچێ . زۆر جاریش دەنگی زەنگەکان ئەوەندە بەرز دەبێتەوە کە ئۆرکێسترا نابیسرێ و بکرە دادەپۆشرێ بۆیە زەنگ لێدەرەکە ـ زۆر جار ـ ناچار دەبێ کە بەپێی بزوتنەوەی تیشکی شانۆ بجوولێتەوە بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە پەیوەندی‌یەکی هەستی‌یانەی بەوانی ترەوە هەبێ . راستە تاقی کردنەوەو حەدسی دەرونی‌ی زۆر جار فریا دەکەون و چارێك بۆ دۆخەکە دادەنێن .. بەڵام بوونی ئەکنەلۆجی نوێ بۆ بەرێوە چوونی ئەو « پارچە ڕۆڕە فورس و تەبەبە » بە سووك و ئاسانی زۆر پێویستە .

بۆیە ئەمڕۆ زەنگەکانی شانۆی بۆلشەوی جارێ تر لە دایك دەبنەوە ... ئەم زەنگانە ئێستاکە تا رادەیەك بە هۆی دەزگایەکی ئەلیکترۆمیکانیکیەوە کاریان پێ دەکرێ و خەڵك لە سەرچاوەی دەنگی بەرز دەرباز بوون و سەیرو سەمەرەش نی‌یەکە خەڵك جاران دەیانگوت ( فلانە کەس وەك زەنگ لێدەر گوێ گرانە ! ) ئەمڕۆ ئەم زەنگ لێدەرە هیچ جیاوازی‌یەکی لەگەڵ مۆسیقا ژەنەکانی تر نی‌یە . ئەمەش شتێکی باشە لەبەر هۆیەکی تریش کە ئەمەیە : سەرەرای قوللەی زەنگەکان . لەسەر شانۆی بۆلشەوی چەند زەنگێکی تر هەیە کە لەچەند جێگایەك لە سەرشانۆکە قایم کراونو بەکار دەهێنرێن . بۆ زەنگە هەرە گەورەکەش دەزگایەکی ئەلیکترۆنی دانراوە .

## پێڵاوی ئاوی

لە ژاپۆن پێڵاوێکی وا لە چەشنێکی تایبەت دروستکراوە بۆ ئەو کەسانەی کە پێیان زۆر دەخورێتو هەست بە ماندوویەتی‌و ئازاری بەردەوامی پێیان دەکەن .. پێڵاوەکە کراوەتە چەند بەشێکەوە پڕیان لە ئاو کراوەو توند بەستراون .. هەر بەشێك لەم بەشانە لە ژێر پەنجەیەکی پێدا دەبێو لە کاتی ڕێ‌کردندا ماندوویەتی‌و خورکە ناهێڵێت .. دەشێت ئەوە بزانین کە هەموو کەسێك دەتوانێت لە پێی بکاتو پێوەی ڕێ بکات بێ‌ئەوەی ئەو بەشانە بتەقێنو لە کاتی ڕێ‌کردندا هەست بە پشوویەکی ئەوتۆ بکات .

## نانێکی پلاستیکی

نانەوای ناسراوی فەرەنسا ( بوالان ) لەم دوایی‌یەدا نانێکی گەورەی پلاستیکی‌ی دروستکردو پێنج‌سەد کیلۆ دەبێت ئەمەش میقداری ئەو نانانەیە کە هەر هاووڵاتی‌یەکی فەرەنسایی لە ماوەی ژیانی‌دا دەیخوات .. ئەوەی شایانی باسە مانگێو نیوێك پێوەی خەریك بووەو دوای تەواوبوونیش لەسەر ئوتومبێلێك ( سلنك ) بە شەقامەکانی پاریسدا گێراویەتی .

## سێیەمین منداڵی بۆری

لە شاری ( ملبۆرن )ی ئوسترالیا یەکەمین منداڵی بۆری لە ئوسترالیادا لەدایكبوو . بە شێوەیەکی سروشتی لەدایك بووەو دایکەیشی ساغو تەندروستی‌ی باشە .. ئەوەی شایانی باسە ئەمە سێیەمین منداڵی بۆری‌یە لە جیهاندا .

# چەکدارە کوردەکان هێرش دەبەنە سەر پاسەوانەکانی خومەینی

- **منتظری ددان بەوەدا دەنێت کە ڕژێمەکەیان بێ هێزە**
- **دابەش کردنی بلاوکراوەی دژ بە خومەینی لە ناوسوپادا**
- **پەرەسەندنی ناکۆکی نێوان تاقمەکەی خومەینی**

**شەوی پێنج شەممەی ڕابوردوو کوردە چەکدارەکان لە کوردستانی ئێراندا هێرشیان بردووەتە سەر پاسەوانەکانی خومەینیی ڕەگەزپەرست لە گوندی ئەندرقاس و گونگالەو ژمارەیەکی تری لادێی دەوروبەری شاری مەهاباد .**

ئیزگەی تارانیش ڕۆژی هەینیی رایگەیاند کە لەو هێرشانەدا چەکی هەمە چەشنە بەکار هێنراون کە چەکی قورسی چەشنی کالیغەر ـ ٥٠ و رەشاشی چەشنی ( ئێم ٠ جی ـ١ ) و ( ئێم ٠ جی ـ٢ ) یان تێدا بووە ، ئیزگەکە ددانی بەوەدا ناوە کە ژمارەیەك پاسەوانانی خومەینیی ڕەگەزپەرست کوژراون و بریندار کراون بەلام باسی شتی تری نەکردووە .

دیسان هەینیی ڕابوردوو منتظری یەکێك لە دەستوپێوەندی تاقمەکەی خومەینی لە وتەیەکدا ددانی بەوەدا ناوە کە ئەم ڕژێمەی ئێستای ئێران بێ هێزە .

پەنجەیشی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە بە شێوەیەکی نایاسایی هاووڵاتیی ئێرانییەکان دەست بەسەر دەکرێن و دەخرێنە زیندان و گرتووخانەکانەوە .

منتظری ددانیشی بەوەدا ناوە کە بلاوکراوەی دژ بە خومەینی و دەستەودایەرەکەی لە ناو سوپادا دابەش کراوەو وتوویەتی « چەند کەسێك هەن ئامانجیان ئەوەیە دووبەرەکی بخەنە سوپاوەو گەل پارچەپارچە بکەن » .

**هەروەها رادیۆنی تاران بڕیارێکی بلاوکردەوە داوای دەرکردنی احمد سلامائیان کە یەکێکە لە یارمەتیدەرە هەر نزیکەکانی سەرۆکی ڕژێمی فارسی ابو الحسن بنی صدر لە پەرلەمانی ئەو وولاتە کردوە.**

رادیۆی تاران رایگەیاند کە سەرۆکی ڕژێمی فارسی ئەویش لە سەرەتی پەیوەندییەکانی لەگەل سلامائیان ببچرێنێت .. هەروەها ووتی سلامائیان کە هەروەها ووتی سلامائیان کە سەرۆکایەتی مەکتەبی سەرەك کۆمار دەکات لە شاری مشهدی باکوری ڕۆژهەلاتی ئێران ووتارێکی داوە تیایدا هێرشی بردۆتە سەر دارودەستەی خومەینی وەکو بەهەشتی و رەفسنجانی سەرۆکی پەرلەمانی ئەو وولاتە . شایانی باسە سلامائیان لەسەر دارودەستەی بنی صدر ـ قطب زادە دەژمێردرێت و لەسەرەتای ئەم سالەدا بۆ ماوەیەکی کورت بەرێوەبەری ئێستگەو تەلەفزیۆنی ئێران بوو لە دوای ئەوە خومەینی لەسەر ئەم کارەی لابرد .

لەلایەکی ترەوە رادیۆی ئەم رژێمە دانی بەوە ناوە کە لەهەفتەی رابردوودا چەند جارێك شەر لە نێوان پاسەوانی خومەینی و لایەنەکانی دژ بە وان لە مازندەران و دەریای قەزوین روویداوە .


نرخی ٥٠ فلسە

ئەم ژمارەیە ١٠٠٠٠ دانەی لێ چاپکراوە

رقم الایداع فی المکتبة الوطنیة ببغداد ١١٢ لسنة ١٩٧٩

